2
ئابی
2006

# پەرستار
Nurse



گۆڤارێکی وەرزی یە کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان دەری دەکات




## دکتۆر حەیدەر بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی فریاکەوتن: رۆژانە بە ئامار نزیکەی (١٦٠٠) نەخۆش روودەکەنە نەخۆشخانەکەمان...



## پرۆفیسۆرێک لە تەمەنی (٥٧) ساڵییەوە دەبێتە پەرستار



## خولی دەرچووانی کۆلێژی پەرستاری لە ئێران هەنگاوێک بۆ ئاشنابوون بەسیستەمی پەرستاری هاوچەرخ

# Peristar

Journal of Kurdistan Nurses Association
August - 2006



کۆلێژی پەرستاری زانکۆی هەولێر
دەرچووانی خولی دووەمی
2005 - 2006

# هەنگاوێک بەرەو چاکسازی پیشەی پەرستاری



خاوەنی ئیمتیاز/سەرۆکی کۆمەڵەی پەرستاری کوردستان

هەروەک ئاشکرایە کە یەکەم هەنگاوی بەرنامەی چاکسازی و بەرەوپێش بردنی پەرستاری بریتییە لە پرۆسەی دەستنیشانکردنی جۆرو قەبارەو کاریگەری گیروگرفتەکان بە مەبەستی چارەسەرکردنیان، هەروەها ئالوگۆڕی بیرو بۆچوون و شارەزایی لە نێو سەرکردەکانی پەرستاران لە ئاستی ناوەخۆیی و جیهانییەوە یارمەتی فراوان بوونەوەی ئاسۆی ئەو ڕێگایانە دەدات کە بەرەو مەبەستمان دەبەن. بەیەک گەیشتنی ئەو پەرستارانەی کە لە کەرتی جیا جیادا کاردەکەن، کەش و هەوایەکی کاری بە کۆمەڵ دروست دەکات کە دەبێتە هۆی یەکبوونی توانایەکان و بەرەوپێش بردنی پەرستاری. بێگومان کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستانیش هەر بۆ ئەم مەبەستانە دامەزراوە بە ئاواتی ئەوەی کە پەرستاران کۆ بکاتەوەو هانیان بدات بۆ دەستنیشانکردنی گیروگرفتەکانی کاری پەرستاری و پیشەی پەرستاری و دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەک بۆیان.

جێگای شانازی ئەندامانی کۆمەڵەکەمان کە گیروگرفتی پەرستاران بە شێوەیەکی هاوچەرخانە بخەینە روو و پەرستاری بە شێوەیەکی تایبەتی باسی لێوە بکرێت.

بێگومان دامەزراندنی کۆلیژەکانی پەرستاری لە کوردستاندا ئاسۆیەکی رووناکی کردۆتەوە بۆ چاکسازی کردنی کاری پەرستاری. لە هەمان کاتدا دوای دامەزراندنی سوپای کوردستان و ڕێکخستنی هێزی پۆلیس و کردنەوەی نەخۆشخانە تایبەتەکان کاتی ئەوە هاتووە کە پەرستاران تەنها لە وەزارەتی تەندروستیدا کار نەکەن بەلکو بخزێنە نێو کۆمەڵ و لە مەیدانی سوپاو پۆلیس و کارگەو قوتابخانەو دایەنگاکانیشدا کار بکەن. ئینجا هاوچەشنی وولاتانی دی و بە مەبەستی سەرپەرشتی کردنی کارو پیشەی پەرستاری پێویستە ئەنجومەنێکی زانستی بۆ پەرستاری دابمەزرێت کە پێک بێت لە نوێنەری هەریەکێک لە کەرتەکانی وەزارەتی تەندروستی و وەزارەتی فێرکردنی باڵاو نەخۆشخانە تایبەتەکان و کەرتی سوپاو پۆلیس بۆ مسۆگەرکردنی بەڕێوەچوونی کاری پەرستاری و یاسای کارکردنی پەرستاران بە شێوەیەک کە پەرستاران و دەزگا حکومیەکان و کۆمەڵیش سوودمەندو رازی ببن. بەم شێوەیە شان بە شانی پزیشک و کارمەندە یاریدەدەرەکان، کۆمەڵێکی بەختیارو لەش ساغ دێتە کایەوە. بە مەرجێک نوێنەرەکانی ئەو کەرتانە پەرستار بن نەک خاوەن پیشەی دی کە بە زمانی پەرستاران قسەی هەلەق و بەلەق بکەن.

لە سەرووی گشت ئەو کارانەی کە بۆ پەرستاری دەکرێت، دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی یاخود یەکەی کاروباری پەرستارییە لە هەریەکێک لە وەزارەتی تەندروستی و فەرمانگەی تەندروستیو نەخۆشخانەو بنکە تەندروستیەکاندا ئینجا دانانی وەسفی پیشەییە (Description Job) بۆ ئاستە جیاجیاکانی پەرستاران کە کۆمەڵەکەمان ئامادەی کردووە. هەروەها دانانی یاسای کاری پەرستاری کە بە هەمان شێوە ئامادە کراوە بە ئاواتی ئەوەی کە لە لایەن پەرلەمانی کوردستان و وەزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستانەوە پیادە بکرێن.

دوا هەنگاوی کارە گرنگەکان لە پێناوی جۆرێکی باش لە کاری پەرستاری ئەوەیە کە لیژنەیەکی چاودێریی بۆ بە دوادا چوون و چاودێریی کارو یاساکانی پەرستاری دابمەزرێت. بە جۆرێک کە ئەو لیژنەیە پێوەری تایبەتی هەبێت بۆ هەڵسەنگاندنی کاری پەرستاری لە دەزگا حکومی و ناحکومیەکاندا.

بە هۆی ئەوەی کە پەرستاریی تەنها بریتی نییە لە بایەخدان بە کەسانی نەخۆش، بۆیە پێویستە لایەنی خۆپاراستن (Prevention) لە بیر نەکرێت و پەرستاران ڕۆڵێکی باشتر ببینن لە بنکە تەندروستیەکان و لە نێو خێزانەکاندا.

# پەرستار

Nurse




گـۆڤـاریـکی وەرزی یـە، کـۆمـەڵەی پـەرسـتـارانی کـوردسـتـان دەری دەکـات

خاوەنی ئیمتیاز
**هوشیار ئەمین ئەحمەد**
٠٧٥٠ ٤٤٧ ٨٥ ٢٧

سەرنووسەر
**فاخر کرمانجی**
٠٧٥٠ ٤٥٣ ٣٦ ٩٠

دەستەی نووسەران
**مامۆستا کەریم فەتاح**
**دیلمان سەلاح**
**رزگار نەقشبەندی**

دەرهێنانی هونەری
**یەعقوب قادر پیرۆت**
yaqoob_qadir@yahoo.com

**کۆمپیوتەری دارا**

## روونکردنەوەیەک...

کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان کۆمەڵەیەکی زانستی و پیشەییە، ئەندامەکانی پێک دێن لە دەرچووانی کۆلێژی پەرستاری بەهەموو پلە کانییەوە لە پلەی (دکتۆرا، ماستەر، بەکالۆریۆس) هەروەها لە دەرچووانی بەشی پەرستاری پەیمانگە تەکنیکییەکان و ئامادەییەکانی پەرستاری و مامانی و قوتابخانە پەرستارییەکان و خوولی خێرای پەرستاری. ئەمانە هەموویان لەژێر چەترێک کۆدەبنەوەو رێکدەخرێت ئەویش (کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان)ە، ئەم پیشەکییەی ئاماژەمان پێکرد زادەی بەرهەمی ماندووبوونی چەندین پەرستارە کە دڵسۆزانە بیریان لە دامەزراندنی کۆمەڵەیەک کردەوە بۆ رێکخستنی پیشەی پەرستاری و پێشخستنی و جیاکردنەوەی لە پیشەکانی دیکەی تەندروستی، چونکە پیشەی پەرستاری لەنێو پیشەکانی دیکەی تەندروستی تایبەتمەندی و جیاکەرەوەی خۆی هەیە ئەگەر بێتو زانستیانە بخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە بۆ گەیشتن بەو ئاماجە کۆمەڵێک لە مامۆستای پەرستاری و پەرستاری چالاک هەڵسان بەدامەزراندنی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان کە سەرەتا ناوی لێنرا (کۆمەڵەی نەخۆشیارانی کوردستان)، خۆشبەختانە لە رێککەوتی ١١ی ئایاری ٢٠٠٥ مۆڵەتی یاسایی خۆی لە وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان وەرگرت دواتر بڕیاری کۆنفرانس دراو لە رۆژی ٥ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٦ یەکەمین کۆنفرانسی کۆمەڵەی نەخۆشیاران ئەنجامدراو ناوی گۆڕدرا بۆ (کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان) بەهەمان شێوە ناوی گۆڤاری (نەخۆشیار) کە ژمارە (١)ی پێش بەستنی کۆنفرانس دەرچوو لەگەڵ گۆڕینی ناوی کۆمەڵە ناوی گۆڤارەکەمان بووە گۆڤاری (پەرستار). بەڵام لەسەر هەمان رێچکەو رێڕەوی خۆی بەردەوام دەبێت بۆ پێشخستن و بە سیستەم کردنی پیشەی پەرستاری لێرەشەوە بە ناوی ستافی گۆڤارەکەمانەوە پەرستارانی بەرێز هاندەدەین بۆ بەشداری کردن و پێشخستنی گۆڤارەکەیان بە نووسینی بابەتی هەمەجۆری (پەرستاری، هۆشیاری تەندروستی، دەروونی و بابەتی رۆشنبیری هەمەجۆر هیواداریین بتوانین هەنگاوی باشتر بهاوێژین...).

ناونیـشـان: هەولێـر/ شـەقـامی ١٠٠ مـەتری بەرامـبـەر تاپۆی دوو

# نەخۆشکەوتنی پەرستاران بەهۆی پاشماوە پزیشکیەکان

هوشیار ئەمین ئەحمەد



بێگومان گەورەترین ئەو مەترسیانەی کە لە بواری تەندروستی پیشەییەوە رووبەڕووی کارمەندانی تەندروستی دەبنەوە بەتایبەتی پەرستاران و پزیشکان بریتیە لەو نەخۆشیە پەتاییانەی کە بەهۆی تێچوونی دەرزی و سرنج و چەقۆو مووس و شووشەی شکاو ڕوودەدات.

بەگوێرەی راپۆرتێکی ئەمریکی وەکالەتی پاراستنی ژینگە بۆ ئەو برینانەی کە بە هۆی ئامێرە تیژەکانەوە ڕوودەدەن، ساڵانە نزیکەی ١٧ - ٢٢ هەزار پەرستار تووشی ڕووداوی برینداربوون دەبن بە هۆی ماددەی تیژەوە، ئەم ژمارەیە گەلێک زیاتریش دەبێت ئەگەرهاتو ڕووداوەکانی ئەو پەرستارانە ئەژمار بکرێت کە لە دەرەوەی نەخۆشخانەکان لە ماڵەکان و خانووەکانی بایەخدان و شوێنەکانی دی کار دەکەن. بە جۆرێک کە ژمارەی پەرستارە تووشبووەکان دەگاتە ٢٨ - ٤٨ هەزار.

چینی پەرستاران زۆرترینی ئەو چینانە پێک دەهێنێت کە ڕووبەڕووی بریندارbوون دەبنەوە بە بەراووردکردن لەگەڵ پزیشک و تەکنیکارانی دی کە لە تایبەتمەندیەکانی تر کار دەکەن ئەویش بەهۆی بەرکەوتنی ڕاستەوخۆ بە جەستەی نەخۆش و ئامێرە بەکار هاتووەکان هەروەها بەکار هێنانی سرنج و ئامێرە تیژەکان بە شێوەیەکی زۆر.

کەچی هەر لە ئەمریکادا ئەو نەخۆشیانەی کە لە ئەنجامی ئەو ڕووداوە زۆرانەوە ڕوودەدەن هەروەک برینداربوونی پەرستاران بە ئامێرە تیژەکانەوە، ئەگەری تووشبوون بە ڕەقبوونەوەی جگەری پەتایی لە نێو ئەو پەرستارانەی کە لە نەخۆشخانەکاندا کاردەکەن ساڵانە دەگاتە ٥٦ - ٩٦ تووشبوون، بەڵام لە نێو ئەو پەرستارانەی کە لە دەرەوەی نەخۆشخانەکاندا کاردەکەن دەگاتە ٢٦ - ٤٥ تووشبوون لە ساڵێکدا.

**ڕۆڵی پەرستاران لە مامەڵەکردن لەگەڵ پاشماوە پزیشکیەکان**

پیشەی پەرستاریی هێڵی بەرگری یەکەمە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسیەکانی پاشماوە پزیشکیەکان. ئەگەر هاتو ئەو مەترسیە هێڵی بەرگری یەکەم ببڕێت، ئەوا ئەنجامەکان زۆر خراپ دەبن. بەڕێوەبردنی پاشماوە پزیشکیەکان بە هیچ جۆرێک سەرکەوتوو نابێت ئەگەر هاتو بەرپرسانی ئەو بەڕێوەبردنە پشت بە چینی پەرستاران نەبەستن، بە جۆرێک کە سیستەمی جیاکردنەوەی پاشماوەکان و کۆنترۆڵ کردنی پاشماوەکان لە سەرچاوەکەیەوە دەست پی دەکات.بۆیە پێویستە تاقمی پەرستاران زانیاریەکی چاکیان هەبێت دەربارەی جۆرەکان و مەترسیەکانی پاشماوە پزیشکیەکان و چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵیان. بڕوا وایە کە بەڕێوەبردنی پاشماوە پزیشکیەکان تەنها بریتیە لە هەبوونی شوێنی سووتاندن و چەند ڕێگایەکی جیا جیا بۆ مامەڵە کردنی پاشماوەکان. بێگومان ئەم بۆچوونە هەڵەیە چونکە بەڕێوەبردنی پاشماوە پزیشکیەکان لەسەر کۆڵەکەیەکدا بنیات دەکرێت کە بریتیە لە کارکردن بۆ ئامادەکردنی پاشماوە پزیشکیەکان بۆ مامەڵەکردن. ئەمەش بە هۆی ئەوەی کە مەترسی پاشماوە پزیشکیەکان تەنها لە کۆکردنەوەو خراپ مامەڵەکردندا نیە بەڵکو لەوانەیە زیانی تووشبوون بە پەتاو ترسناکیی پاشماوەکان بەر لە گەیشتنیان بۆ شوێنی سووتان و مامەڵەکردن ڕووبدات.

بۆیە دەبینین ئەنجومەنی جیهانیی پەرستاری و کۆمەڵە نەتەوەییەکانی پەرستاری لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا گرنگیەکی زۆریان داوە بە پاشماوە پزیشکیەکان و لە پێناوی توندکردنی ڕۆڵی پەرستاریدا کاریان کردووە بە مەبەستی نەهێشتنی مەترسیەکانی خراپ مامەڵەکردنی پاشماوە پزیشکیەکان. ئەو ڕێکخراوانە چەند بڕیارێکیان داوە لە پێناوی کەمکردنەوەی کاریگەرە زیانبەخشەکانی پاشماوەکان. لێرەوە پێویست دەکات کە لەم بارەیەوە خولی ڕۆشنبیری بۆ پەرستارانی دەزگا تەندروستیەکانی کوردستان بکرێتەوە بە جۆرێک کە لە سیستەمی جیاکردنەوەی کیسەکان دەست پی بکات کە ڕەنگی جۆراوجۆریان هەیە بۆ جیاکردنەوەی ئامێرە تیژەکان لە پاشماوەکانی دی. بەم جۆرە بەڕێوەبردنێکی سەرکەوتووانەی پاشماوە پزیشکیەکان دەهێنینە کایەوەو سیستەمی کۆکردنەوەو گواستنەوەو مامەڵەکردنی پاشماوە پزیشکیەکان زۆر ئاسانتر دەبێت.

# چالاکیەکانی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان

کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان بە پێی فەرمانی وەزارەتی ناوخۆی هەرێمی کوردستان لە رۆژی ٢٠٠٤/٥/١١ مۆڵەتی پی دراوە. ئەندامانی کۆمەڵەکەمان بە شێوەیەکی خۆبەخشانە و سەرباری گرانی هۆیەکانی هاتوچۆو باری گوزەران لە پێناوی بەرەو پێش بردنی پیشەی پەرستاریی و خزمەتگوزاریەکانی پەرستاریی، چەندین چالاکی ئەنجام داوە:

**سازدانی یەکەمین کۆنفرانسی ناوخۆیی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان**

بە مەبەستی خۆ رێکخستنەوە و شەرعی بوونی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان ئەندامانی کۆمەڵەی پەرستاران لە سەر ئەرکی خۆیان یەکەمین کۆنفرانسی ناوخۆیی یان لە رۆژی پێنجشەممە ٢٠٠٥/١/٥ سازدا لە ژێر دروشمی (زانست - تەندروستی - پەرەپێدان) کە تیایدا. پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆیی تاوتوی کراو پاشان سەرۆکی کۆمەڵەو هەشت ئەندامی دەستەی باڵا هەڵبژێردران.



**چالاکیە زانستی و پیشەییەکانی کۆمەڵەکەمان**

١. سازدانی کۆڕو کۆبوونەوەی بەردەوام لەگەڵ پەرستارانی نەخۆشخانە و بنکە تەندروستیەکان بۆ دیاری کردنی گیروگرفتەکان و دۆزینەوەی چارەسەر بۆیان.

٢. دانانی پلانی مەشقی ساڵانەی پەرستاران بە هاوکاری لەگەڵ وەزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستان ئێستاش کۆمەڵەکەمان پلانێکی نوێی پێشکەش کردووە.

٣. سازدانی چەند سیمینارێک دەربارەی ئەنفلەوەنزای باڵندە بۆ کارمەندانی وەزارەتی ناوخۆ و وەزارەتی دارایی و رێکخراوە جەماوەری پیشەییەکان کە سەنتەری (تیشک) ی زانستی شوێن و کاتی بۆ رێک دەخست.

٤ . بەشی چالاکی کۆمەڵەکەمان هەستا بەکردنەوەی خولێکی وەرزشی بۆ تۆپی پێ بۆ سەرجەم نەخۆشخانەکانی ناو شاری هەولێر کە تیایدا لە قۆناغی کۆتایی یاریەکان تیپی نەخۆشخانەی رزگاری سەرکەوت بەسەر تیپی نەخۆشخانەی هەولێری فێرکردن ، لە کۆتایی یاریەکەشدا دیاری بەسەر تیپە سەرکەوتووەکان دابەشکرا.

٥. سازدانی چوار خولی مەشقکردن بۆ پەرستاران و کارمەندانی تری دەزگا تەندروستیەکان دەربارەی ئەنفلەوەنزای باڵندە لە نەخۆشخانەی رزگاری، هەولێری فێرکردن، کەرتەکانی تەندروستی لە ناوچەی سۆران، کەرتەکانی تەندروستی دەوروبەری شاری هەولێر.

٦. سازدانی چەند سیمینارێک دەربارەی بی میکرۆب کردن و پاککردنەوە (التعقیم والتطهیر) بۆ پەرستارانی نەخۆشخانەی رزگاری و هەولێری فێرکردن و لە دایکبوون و منداڵان.

٧. ئامادەکردنی دوو نامیلکە



(پەرتووک)، یەکەمیان بە ناوی هەنگاوە کردەییەکان بۆ پەرستاران و دووەمیان بە ناوی (التحکم فی عدوی المستشفیات) بە زمانی عەرەبی کە وەزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستان ئەرکی لە چاپدان و بلاوکردنەوەی خستۆتە ئەستۆی خۆی و کاری لەسەر دەکات.

٨. رێکخستن و بەشداری کردن لە چەند کۆبوونەوەیەک لەگەڵ بەرێز وەزیری تەندروستی بە مەبەستی داکۆکی کردن لە مافەکانی یەکەم خولی دەرچووانی کۆلیژی پەرستاری بۆ ئەوەی وەکو پزیشکی نیشتەجی مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت هەروەکو لە یاسای عیراقیدا هاتووە.

٩. پێشکەشکردنی پێشنیار و گفتوگۆکردن لەگەڵ بەرێز وەزیری تەندروستی هەرێمی کوردستان بە مەبەستی زیادکرنی مووچەی پەرستاران.

١٠. پێشکەشکردنی یادداشتی رازی نەبوون لە بڕیاری زیادکردنی ١٥٠ هەزار دیناری دەرماڵەی مەترسی تەنها بۆ پزیشک و دەرمانسازان بە جۆرێک کە پەرستاران لە ریزی پێشەوەی تیمی تەندروستین بۆ بایەخدان بە نەخۆش و تووش بوون بە نەخۆشی.

**بەشداری کردنی کۆمەڵەکەمان لە کۆنفرانس و کۆنگرەکان:**

١. کۆنفرانسی دانانی ستراتیجیەتی پەرستاری بۆ سەرتاپای عیراق کە بۆ ماوەی پێنج رۆژ لە عەممانی پایتەختی ئوردن بەسترا.

٢. خولی کارکردن بۆ رەووشتی پیشەیی بۆ پەرستاران کە بۆ ماوەی پێنج رۆژ لە عەممانی پایتەختی ئوردن بەسترا.

٣. کۆنفرانسی پێداچوونەوە و گۆڕینی پرۆگرامی خوێندنی پەرستاری بۆ سەرتاپای کۆلیژەکانی پەرستاری لە عیراقدا کە بۆ ماوەی پێنج رۆژ لە عەممانی پایتەختی ئوردن بەسترا.

٤. کۆنفرانسی گۆڕینی سیستەمی تەندروستی کە لە شاری دهۆک بەسترا.

٥. کۆنفرانسی دایکایەتی و منداڵان کە لە وەزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستان بەسترا بە بەشداری کردنی گشت پسپۆڕو کارمەندانی پەیوەندیدار لە هەمو شارەکانی عێراقدا.

٦. بەشداری کردن لە یەکەمین کۆنفرانسی زانستی کۆلیژی پەرستاری / هەولێر.

٧. سازدانی سیمینارێک دەربارەی رۆشنبیری تەندروستی ژینگە لە یەکەمین کۆنفرانسی ژینگە کە لە شاری هەولێردا بەسترا. لەم سیمینارەدا پسپۆڕانی ژینگە لە گشت ناوچەکانی عیراق ئامادەبوون و سیمینارەکەش جێگای رەزامەندی پسپۆڕانی ژینگە بوو.

**پەیوەندیەکان**

١. بەمەبەستی پەیوەندی کردن و ئاشنابوون بە سیستەمی بەرێوەبردنی





(نەخۆشخانەی زەیتوون) کە سەر بە تیپی زەیتوونی کۆریای باشووره، کۆمەڵەکەمان سەردانی نەخۆشخانەکەی کردو پشتگیری خۆمان دەربری بۆ مەشقکردنی پەرستاران لە نەخۆشخانەکەدا. هەروەها ئەم سەردانە بوە هۆی مایەی دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵەی پەرستارانی کۆریا کە ئامادەیی خۆی دەربڕیوە بۆ یارمەتیدانی کۆمەڵەکەمان بە جۆرێک کە چاوەڕوانی جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیە دەبین کە پێشکەشمان کردوە.

٢. کۆمەڵەکەمان پەیوەندی بە چەند وەزارەتێک و رێکخراوێک کردوە بە مەبەستی ئەنجامدانی چالاکی رۆشنبیری تەندروستی لە دەوروبەری شاری هەولێر.

٣. بە مەبەستی داکۆکی کردن لە زیادکردنی دەرماڵەی پیشەیی کارمەندانی تەندروستی بە گشتی و پەرستاران بە تایبەتی، سەرۆک و ئەندامانی دەستەی باڵای کۆمەڵەکەمان بەشداریان لەو کۆبوونەوەیە کرد کە سەندیکاکان لە شاری سلێمانی رێکیان خستبوو، تیایدا دەنگی کۆمەڵەکەمان خرایە پاڵ دەنگی ئەو سەندیکایانەی کە داوای دەرماڵەی مەترسیان کرد بۆکارمەندانی تەندرستی بەگشتی لە هەرێمی کوردستان.

٤. سەرۆکی کۆمەلەکەمان و بە یاوەری بەشێک لە ئەندامانی دەستەی باڵای کۆمەلەکەمان سەردانی شاری دهۆکیان کرد بە مەبەستی کۆبوونەوە لەگەل نوێنەرانی کۆمەلەی پەرستارانی کوردستان لە شاری دهۆک کە لە میانەی سەردانەکەدا لەگەل سەرجەم نوێنەرانی نەخۆشخانەکانی شاری دهۆک کۆبوونەوە و لە کۆبونەوەکەدا رێوشوێن و ئامادەکاریەکانی بەستنی کۆنفرانسی لقی دهۆک خرایە بەرباس و لێکۆڵینەوە و بریاردرا لە ماوەیەکی نزیکدا کۆنفرانس ببەسترێت.

٥. بە مەبەستی بەشداری کردن لە خەڵاتکردنی قوتابیانی یەکەم و دووەم و سێیەمی هەریەکە لە قوتابیانی دەرچووی ئەم ساڵی خوێندنی کۆلێژی پەرستاری و بەشی پەرستاری پەیمانگەی تەکنیکی هەولێرو ئامادەیی پەرستاری هەولێرو ئامادەیی مامانی هەولێر کۆمەڵەکەمان هەڵسا بەدابەشکردنی خەڵات بەسەر قوتابیانی دەرچووی پەرستاری ئەو قوناغانەی کە ئاماژەمان پێکرد هەروەها بە مەبەستی رێزگرتن و بەسەرکردنەوەی ئەو ماموستاو پەرستارانەی کە لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان رۆڵیان هەبووەو وەکو دەستەی دامەزرێنەر کاریان کردووە بۆ دروست بوونی کۆمەڵەی پەرستاران سەرۆکی کۆمەڵەکان لەگەڵ ئەندامانی دەستەی باڵا ئەو بەرێزانەیان بەسەر کردنەوەو خەلاتی رێزلێنانی پێشکەشی کردن.

**یادکردنەوەی رۆژی جیهانیی پەرستاران**

بە مەبەستی یادکردنەوەی رۆژی جیهانی پەرستاران و رۆژی دامەزراندنی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان کۆمەڵەکەمان بە هاوکاری وەزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستان لە نەخۆشخانە و دەزگا تەندروستیەکاندا یادی هەردو بۆنەی کردەوە لە رۆژی ١٢/٥/ ٢٠٠٦ کە رۆژی جیهانی پەرستاران و رۆژی دامەزراندنی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستانە.

**راگەیاندن**

١. کۆمەڵەکەمان پێش ئەوەی کۆنفرانسی یەکەمی خۆی ببەستی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (نەخۆشیار) ی بلاوکردەوە بە جۆرێک کە تەنها وەزارەتی تەندروستی ئەرکی لە چاپدانی خستە ئەستۆی خۆی.

٢. سازدانی ٣ سێ دیمانە لە تەلەفزیۆنی زاگرۆس دەربارەی ئەنفلەوەنزای باڵندە بە مەبەستی ئاشناکردنی خەلک بە نەخۆشیەکە و چۆنیەتی خۆپاراستن و کەمکردنەوەی ترسی خەڵک لە بەکارهێنانی گۆشتی مریشک بە شێوەیەکی چاک.

٣. نوێنەری کۆمەڵەکەمان دیمانەیەکی لە تەلەفزیۆنی زاگرۆس سازکرد بۆ ئاشنا کردنی خەلک دەربارەی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان.

# کۆمەڵەی پەرستاران.. ئامانج و دروست بوون

بەپێی ئەو تایبەتمەندییانەی کە کۆمەڵگەی کوردی لە دوای راپەڕین پیایدا تێدەپەڕی زۆر گۆڕانکاری لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و جەماوەری نێو شەقامی کوردی و خودی ئەو بیرکردنەوەی کە کورد جاران هەیبوو پەیدابوون ئەم جۆرە گۆڕان و ئەو مۆدێلە نوێیەی کورد لەسەر ئاستی دەسەڵاتی حکومی هەیەتی جۆرێک لە گۆڕانی ئەوعی پەیدابوو بەتایبەتی لەسەر ئاستی جەماوەری و پیشەیی کۆمەڵگەی کوردی دابەش بوو بەسەر چەندەها پێکهاتەو بوون بە بەشێک لە کۆمەڵگە کە زیاتر خۆی لەو رێکخراوانە دەبینیەوە کە خاوەن پیشەیەکی تایبەت یاخود توێژ بوون ئەمە بووە هۆی ئەوەی چەندین کۆمەڵەو رێکخراو و سەندیکا بێنە بوون بۆ داکۆکی کردن لە ئەندامانی خۆی بەپێی ئەو قۆناغە جوگومرانییەی کە دەسەڵاتی کوردی دروستی کردبوو، کۆمەڵەی پەرسیتارانیش یەکێکە لەو کۆمەڵانەی کە پێویستی دامەزراندنی بوو بە حەتمی بۆئەوەی وەکو چۆن سەندیکای پەرستارانی جیهان هەیە کە لە چەندین وڵات سەندیکاکانی پەرستاران ئەندامن لەو سەندیکا جیهانییە ئەوانیش ببن بە بەشێک لەو سەندیکا جیهانییە کە ئامانجیان خزمەت کردن و پێشخستنی کاری پەرستارییە لە جیهاندا بۆئەوەی خزمەتی مرۆڤ بکەن، سەبارەت بە دامەزراندنی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستانیش کە چۆن دامەزراو هاتە کایەوەو مۆڵەتی وەرگرت لە وەزارەتی ناوخۆ دەستەی باڵای ئەو کۆمەڵەیە بۆمان هاتنە دوان:

ئامادەکردنی: گرماڤی

**سەرەتا رووی پرسیارمان کردە بەڕێز (مامۆستا هوشیار ئەمین) سەرۆکی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان سەبارەت بە بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان وتی:** بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان دەمێکە هەبووە تەنانەت لە عێراقدا لەسەردەمی پاشایەتییەوە یاسای سەندیکای پەرستاران هەبوو کە تاکو ئێستا هیچ بڕیارێکی هەڵوەشاندنەوەی نەدراوە بەڵام لەسەردەمی رژێمی بەعسدا ئەو یاسایە کاری پێ نەکرا. دوای راپەڕینە مەزنەکەی خەڵکی کوردستان بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان لەلایەن چەند



پەرستارێکی دڵسۆزەوە پەیدابوو دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر خۆش بەختانە رۆژی ۲۰۰٤/٥/۱۱ مۆڵەتی یاسایی لە وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان پێدراو لە رۆژی ۲۰۰٦/۱/٥ یەکەمین کۆنفرانسی

ناوخۆی ساز کرد کە تیایدا سەرۆک و (۸) ئەندامی دەستەی باڵاو (۲) ئەندامی یەدەگی دەستەی باڵا هەڵبژێردران، بەمەرجێک سەرۆکی هەر لقێک لەشارو شارۆچکەکان دوای کردنەوەی لقەکانی ببێتە ئەندامی دەستەی باڵا لەسەرەتای دامەزراندنەوە ئەوەی یارمەتی ئێمەی داوە تەنها ئەندامانی دەستی دامەزرێنەرو حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو ئەوانەی رۆڵیشیان هەبووە لە پشتگیری کردنی کۆمەڵەکەمان دەتوانم بڵێم بەڕێز وەزیری تەندروستی و بەشی پلاندانان لە وەزارەتی تەندروستی بەشی فێرکردنی تەندروستی وەزارەت هاوکاریان کردین لە دابینکردنی خەرجی و پشتگیری

کردنی کۆمەڵەکەمان، هەروەها زۆر سوپاسی وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەین هەروەها سوپاسی پارێزگای هەولێر دەکەین بۆ پشتگیری کردنی سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەین کە یارمەتی ئێمەیان داوە تاوەکو کۆمەڵەکەمان دروست بێت.

**ئاونگ حوسێن مەحمود وەک پەرستارێکی ئافرەت و ئەندامی دەستەی باڵای کۆمەڵەی پەرستاران و جێگری سەرۆکی کۆمەڵە سەبارەت بە ڕۆڵ و بەشداربوونی پەرستارانی کچ لەبەشداری کردنیان لە کۆمەڵەی پەرستاران وتی:**



لەبەر پیرۆزی پیشەی پەرستارو گرنگی ئەو پیشەیە لە رووی مرۆییەوە یەکەم کەس کە هەستاوە بەوکارە و ئەو پەیامە پیرۆزەی خستۆتە ئەستۆی خۆی ئافرەت بووەو ئێستاش لە زۆربەی هەرە زۆری ولاتاندا هەر ئافرەت ئەو پیشەیە بەڕێوەدەبات. دەربارەی ئافرەتی کوردو کاریگەری لەسەر باری تەندروستی و روولی ئافرەتی کورد لە بەڕێوەبردن و بەشداریان لە رێکخراو و کۆمەڵەو دەزگاکانی مەدەنی هێشتا روو لە کزیە، ئەویش دەگرێتەوە بۆچەند هۆیەک کە پەیوەستن بەداب و نەریت و چاولێکەری و هەندێ خورەوشتی کۆنەپەرستانەو دوورکەوتنەوە لە رەوشی رەسەنایەتی کوردەواری.

پەرستارانی ئافرەت دەبێ هەوڵ و توانایی خۆیان بخەنە گەڕ بۆ بەدەست هێنانی ئامانجە پیشەییەکانی خۆیان و لە هەمان کاتیش هاوکارو پشتیوانی کۆمەڵە بن، دەبێ خۆیان ئامادەباشیان تێدابێت چونکە کۆمەڵە هەر چەند هەوڵیان بۆ بدات ئەگەر ئەوان خۆیان بۆ باشترکردنی کاروپیشەی پەرستاری هەوڵ نەدەن، کارەکان سەرکەوتوو نابن، دەبێ هەوڵ بدەن ئاستی زانستییان بەرزبێتەوە بۆیە پێویستە لە سیمینارو خولی جۆراوجۆر کە لەلایەن کۆمەڵە دەکرێتەوە بەشداری بکەن.

هەروەها پێویستە ئاورێک لە خۆمان و پیشەکەمان بدەینەوە کە ئایا ئافرەتانی ئێمە تا چەند توانیویانە سەرنجی خەڵکی بەرەو پیشەکەمان رابکێشن، ئێمە دەبێ رۆڵی خۆمان ببینین لەبەرچاوخستنی پیشەی پەرستاری باشتر خزمەتی تەندروستی پێشکەش بکەن.

**دواتر بەڕێز مامۆستا کەریم لە میانەی ئەو پرسیارەی کە لە ماوەی دەست بەکاربوونت لە لیژنەی پەرەپێدان ئایا ئەم کارو چالاکییانە چییە کە ئەنجامت داوە لە کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان؟**



**وتی:** لە وەڵامی پرسیارەکەدا دەمەوێ بەڕێزتان ئاگاداربکەمەوە کە لەماوەی دەست بەکاربوونم لە بەشی پەرەپێدان هەڵسام بە گێڕانی سیمینار لە گشت نەخۆشخانەکانی ناو شاری هەولێر دەربارەی (بێ میکرۆب کردن و پاکژکردنەوە) لە نەخۆشخانەکاندا و لە ئەنجامیدا زۆر زانیاریم کۆکردەوە دەربارەی هەبوونی کێشەی پەرستاران و کێشەی پاککردنەوە و خاوێنی نەخۆشخانەکاندا و هەموو ئەو کێشانەم بەشێوەی راپۆرت پێشکەش بە کۆمەڵە کرد بۆ ئەوەی بەپێی پێویست دەست بەکار بین بۆ چارەسەرکردنیان. هەروەها دوای ئەم پرۆژەیەش دوو پرۆژەی ترم ئامادە کردووە بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی پەرستاران لە نەخۆشخانەکاندا و من زۆر دڵنیام کە زۆر کەم لە پەرستاران پەرتوک دەخوێننەوە بۆ زانیاری وەرگرتن و زۆربەی زۆریان تەنها پشت دەبەستنە سەر شێوەی بیستن و بینین بۆ وەرگرتنی زانیاری. بۆیە من لەم رووەوە هەوڵ دەدەم کە ئەم کەلێنە پڕ بکەمەوە

بەپێی توانا بۆئەوەی پەرستاران ئاستی رۆشنبیری و تەندروستییان بەرزبێتەوە.

**دواتر بەڕێز دیلمان سەلاح ئەندامی دەستەی باڵاو بەرپرسی چالاکییەکان وتی:**



دروست بوونی هەر سەندیکایەک یاخود کۆمەڵەو گروپ بۆ خزمەت کردنی توێژێک یاخود چینێک دادەمەزرێ هەر بۆیەش کۆمەڵەی پەرستاران لەسەر ئەو بنچینەیە دامەزرا کە بتوانێ تواناو بەرنامەکانی خۆی بخاتە خزمەتی پەرستاران و وەک هەر کۆمەڵەو سەندیکایەک مافی پیشەیی و نەتەوایەتی خۆی هەیە کە لە هەرێمی کوردستاندا کاری خۆی دەکات و داکۆکی لە مافی پەرستاران دەکات و بەردەوام لە هەوڵداین بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی پەرستاری. ئاواتمان ئەوەیە پەرستارانیش بتوانن لە رێگای ئەم کۆمەڵەوە داوای مافی یاسایی و پیشەییەکانیان بکەن و دەخوازم وەک بەشی چالاکییەکان بتوانم لە ئاست ئەو بەرپرسیارییەتەدابم کە پەرستاران بەمنیان بەخشی، لەم ماوەیەشدا توانیومانە چەندین چالاکی ئەنجام بدەین لەوانە (کردنەوەی خولێکی تۆپی پێ لەسەر ئاستی نەخۆشخانەکانی شاری هەولێر، دابەش کردنی خەڵات بەسەر قوتابییە یەکەمەکانی کۆلێژی پەرستاری و پەیمانگەی تەکنیکی بەشی پەرستاری و ئامادەیی پەرستاری کچان و ئامادەیی مامانی، دابەش کردنی خەڵات بەسەر مامۆستایان و دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەداو وێڕای بەستنی چەندین کۆڕو سیمینارو جۆراو جۆر لە دامودەزگا حکومییەکان و تەندروستییەکان و وە سەردانی دەڤەری سلێمانی و دهۆک) و لە هەگبەماندا هەیە لە هەموو بنکەو نەخۆشخانەکانیشدا چالاکی جۆراوجۆر ئەنجام بدەین.

**دواتر بەڕێز بەختیار ئەمین ئەندامی دەستەی باڵاو بەرپرسی پەیوەندییەکان سەبارەت بەم بەشە وتی:** ئێمە وەکو (ک.پ.ک) پەیوەندییەکی باشمان هەیە لەگەڵ ئەو رێکخراوانەی کە هاوکارمانن بۆ بەرەو پێش بردنی ئاستی زانستی پەرستاری لە هەرێمی کوردستان هەروەها وەزارەتی تەندروستی پەیوەندیمان لەگەڵیان هەیەو بۆ رێگەخۆشکەر بووە کە کۆمەڵە هەڵسێت بەکارەکانی خۆی و برەودان بە زانستی پەرستاری، بەهۆی ئەوەی لەگەڵ دەستەی باڵای سەندیکای خاوەنی پیشە تەندروستییەکانیش لە چەند خاڵێک لێک نزیکین بۆیە پەیوەندی باشمان بەیەکەوە هەیەو بۆ مەبەستی زیاتر خزمەت کردنی گشت پەرستاران و خاوەن پیشە تەندروستییەکان. تیمی زەیتونی کۆریش یەکێکن لەوانە کە کۆمەڵە پەیوەندی لەگەڵیاندا هەیە. بیروبۆچوونەکانمان ئاڵوگۆڕ کردووەو لە بۆنەکانیان کە پەیوەندی بە پەرستاران هەبێت بانگهێشتی نوێنەری کۆمەڵەیان کردووەو وتەی کۆمەڵەمان بە گوێیاندا چرپاندووەو ئامادەیی خۆیان بۆ هاوکاری کردن دەربڕیوە بۆ کۆمەڵەی پەرستاران.

هەروەها پەیوەندیمان لەگەڵ وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان تاوەکو مۆڵەتی رەسمیمان پێداین هەروەها پەیوەندیمان لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی گشتی دارایی و پارێزگای هەولێردا هەیە بۆ مەبەستی بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکانمان هەروەها فەرمانگەی



تەندروستی هەولێر کە هەر شتێک بێت بێ هەماهەنگی ئەوان نایکەین سەرەڕای ئەوەش پەیوەندییمان لەگەڵ زۆربەی نەخۆشخانەو بنکەی تەندروستییەکانی ناوشاری هەولێرو شوێنەکانی تر هەیە.

# سوودمەندانی بایەخدانی تەندروستی

# Patient / Client



**حەمدیە میرخان ئەحمەد**
**. ماستەر لە پەرستاری**

وشـــەی Patient (نەخـــۆش) بۆ ئەو کـەســانە بەکـاردێت کـە بایەخـدانی تەندروســتی وەردەگــرن، لە وشــەیەکی لاتینی کــە مــانای نارامگرتن دەدات وەرگـیراوە بۆ وەسف کـردنی ئەو کـەسانە بەکـاردێت کـە پێویســتە بە وەرگـرتنی چاودێری پەرســـتـــاری هەیە. هەر وەشـەیەکـیش گـوزارشت لەو مـانایانە دەکات کە تێدایە. لەبەر ئەوە پەرستاران پێیان باشترە وشەی Client بەکاربێن کــە لە وشــەیەکی لاتینی (to lean) وەرگیراوە کە مانای پشتبەستن دەدات کە گــوزارشت لە هاوپەیمانی و بەیەکــەوە پەیوەندبوون دەکات.

### گیروگرفتەکانی نەخۆش

بێگومــان چەقی بازنەی ئامـانجـەکـانی خـزمــەتگوزاریــەکـانی تەندروســتی نەخـۆشـە. نەخـۆش لەکـاتی سـەردان بۆ نەخۆشخانەیەک یان بنکە تەندروستییەک گـیـروگـرفت یان گـیـروگـرفـتـەکـانی رادەگـەیەنێت لەگـەڵ ئەوەشـدا دەبێ بزانین کــە نەخــۆش وەک تاکــەکــەســیکە، ئە ندامێکە لە خێزانێک و هاولاتییەکە لە کۆمەڵگەیەک.

نەخۆشەکان، بەزۆری خاوەن بیروباوەڕی تایبــەت بەخــۆن کــە لەگــەڵ بارودۆخی تەندرســتــیــەکــە تێکەڵ بووە. لەکـاتی ڕووبەڕووبوون بە گــیـروگـرفـتـەکـانی تەندروستی لەوانەیە نەخۆش وابزانێت کە ئەوانە چارەسـەر ناکرێن و هیچ کـاتێک ناتوانی لێــیــان رزگــاربێت و یان ئەم گیروگرفتانە بپۆشێ، یان چارەسەری هەیە بەڵام ناتوانێت چارەسـەریان بکات. یان هەست بـکـات بەتـەنـیـــــایە بـۆ چارەســەرکــردنیــان، لەوانەیە لەناو ئەم گیروگرفـتـانە بتاوێتـەوە کە لە ڕاستیـدا ئاکـامی بچووکن و ئەوانەی کـە گـرنگن فەرامۆش بکات.

یەکێک لە گرنگترین کارەکانی پەرستار یارمـەتیـدانی نەخۆشـە بۆ جیـاکـردنەوەی گـیـروگرفـتـەکـانی، کـەم کـردنەوەیان بۆ ئەوانەی کـــە پێـــویســتن، دانانیـــان لە جێگـای شـیـاو وکـاریگـەرانەی نەخـۆشـە لەگەڵ ئەم گیروگرفتانە.

### گیروگرفتەکان، نیشانەکانی سەختی نەخۆشین

بەڕای نەخۆشـەکـان گرنگترین گـیروگرفت ئەو نیشـانانەن کە زۆر بەرچاو و گەورەن. بۆنموونە ئەگـەر نەخـۆشـێـک هەنـاسـەی تەنـگ بێت (dyspnea)، گــەورەترین پێویسـتـیـەکـەی ئەوەیە کە ئەم تەنگژەی هەنـاسـەی لابدرێت. هەنـاسە تەنگی یەکەم نیـــشــــانەیە. بۆ هەڵســـەنگاندنی ئەم نیــشــانەیە (Symptom)و بۆ هێــور کـردنەوەی کـاریگـەرانەی، پەرسـتـار دەبێ بە دروستی زەمـینە خۆشکەری فـیزیولۆژی و پاتولۆژی ئەم هەنـاســە تەنـگـیـــەی بـزانـێـت، ئـایـا ئـەوە بـە هـۆی ئـاپـوورەی هەنـاســەیی، نیــمــۆنیــا، پلوریزی یان ئەسمایە؟ ئایا هیـچ بەربەسـتێک لە بۆڕی هەنـاسـەدانی هەیە؟ ئایا نەخـۆش دەبێ لە حــاڵـەتی Orthopneic بێت یان لە حاڵەتی دانیشتن یان لە حاڵەتی درێژکراو دا بێت؟ ئایا نەخـۆش دەبێ ئوکـسـجین وەربگرێت؟ ئایا پێـویسـتی بە مـژینی بۆڕی هەنـاســەی هەیە؟ ئایا پێــویـسـت دەکـات سۆندەیەک لەناو بۆڕی هەنـاسـەی دابنرێت؟ ئـایـا دەبێ دەرمـــــانـی ئـارام بەخـشـی بدرێتی یاخود ئەم جۆرە دەرمانە نابێ لەم نەخۆشانە بەکاربێت؟

لەوانەیە لەکـاتی هەڵسـەنگاندنی وردی نەخـۆش، پەرسـتـار باوەڕی پێ دێت کـە هەناسـەکـێشـانی نەخـۆشـەکە، هەرچەندە خێراو قـووڵە بەڵام نابێتـە هۆی بێزاری و ناڕەحـەتی نەخـۆش. بەنامـایەکی تر ئەم نەخۆشە هەناسـەی تەنگ نییـە لەوانەیە تەنیـا قـووڵایی و ژمـارەکـانی هەناسـەی زیاد بووە. ئەم جـۆرە هەنـاسـەکـێـشـانە نیـشـانەیەکی جـیـاوازە لەگـەڵ هەناسـە سواربوون. دەبێ بزانرێت کە ئەم نەخۆشە پێشـینەی ئەم جۆرە هەناسە کێشانە یان ترشی شەکرەی هەبووە؟ ئایا ئەم نەخۆشە ژەهراوی نەبووە؟

وەڵامی گونجاوی ئەم پرسیارانەو پرسیارە بەتینەکـانی تر پەیوەندی بە دروســتی دیارکـردنی نەخـۆشی، دەست تێـوەردانی کارێگەرانەی پەرستار و لە زۆر حاڵەتی تر شانسی مانەوەی نەخۆشە لە ژیان.

هەر هەنگاوێک بۆ چاودێری کــردن لە نەخـۆش نیـشـاندەری هەوڵی تیـمـێکی تەندروســتـیــیە، پەرسـتـاری کـارامـەو ئەندامـێکی زۆر گـرنگ و سـەرەکی ئەم

تیمەیە کە بەرپرسیارە لە ئەستۆگرتنی لێپرسراوەتی ئەم نەخۆشە، یەکێک لەو ئەرکانەی کە پەرستار ئەنجامی دەدات بۆ بەشدارییەتی لەگەڵ تیمی تەندروستی کە دەبێتە هۆی بوونی بە ئەندامێکی سەرەکی لەم تیمە، چاودێری کردنی کلینیکی نەخۆشە. رادەی گرنگی و پڕ زانیاری و یارمەتیدەرانەی ئەم چاودێریانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پەرستار تا چ رادەیەک زانیاری هەبێت و لە نیشانەکانی نەخۆش تێ گەیشتبێ بیت. لە کاتی رووبەڕووبوونی پەرستار لەگەڵ نیشانەیەک، پەرستار دەبێ توانای ناسینەوەی هەبێت کە ئایا ئەم نیشانە لە حاڵەتی ئاساییە یان نە؟ هەروەها دەبێ زانیاری هەبێت سەبارەت بە شێوازی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لەناو کۆمەڵگەو تایبەتمەندییەکانی لەناو تاکەکەساندا.

## پێویستییەکانی سەرەکی نەخۆش

هەندێک پێویستی سەرەکی و بنەڕەتی هەن کە هاوبەشن لەناو هەموو مرۆڤێکدا. ئەم پێویستیانە ئەوانەن کە لە هەموو شتێکی تر لە پێشترن و مانای ئەوەیە کە فشار دەخاتە سەر مرۆڤ. پێویستییەکانی بنەڕەتی و سەرەکی تەنانەت ئەو نیشانەی کە لە ئاستێکی بەرزیش دایە، وات لێ دەکات بۆ بەجێ هێنانی ئەم پێویستیانە بڕوات. سێ گۆشەی ئەم پێویستیانە بەم شێوەیە پیشان دەدات:

پێویستی بەگەیشتن بە راستەقینە خۆی
پێویستییەکانی رێزو رێزداری
پێویستییەکانی پەیوەندبوون و سۆزو خۆشەویستی
پێویستییەکانی ئاسایش و ئەمنیەت
پێویستییەکانی جەستەیی

بەشی خواردوەی پێویستییەکان هەمیشە دەمێنەوە، بەڵام کاتێک کە فشاریان کەم دەبێتەوە مرۆڤ دەتوانێت هەست بە پێویستییەکان بەرزتر بکات. ئەو کەسەی کە هەست بە پێویستییەکانی بەرز دەکات ئەو کەسەیە کە بۆ لای تەندروستی دەروونی دەڕوات. پێویستە ئەنجام دانی چاودێری پەرستاری بەتێگەیشتن لەم سێ گۆشەیە بێت.

## پێویستییەکانی جەستەیی

پێویستییەکانی جەستەیی بریتین لە رێکی هەناسەکێشان، خواردن و خواردنەوەی گونجاو، پشوودان و نووستن و نەبوونی هیچ ئێش و ئازارێک. هەروەها سێکس پێویستییەکی بنەڕەتییە، بەڵام بۆ مانەوە لە ژیان زەروور نییە. پێویستییەکانی جەستەیی زۆر بەهێزن و ئەگەر رازی نەکرێن بەسەر هەستەکانی تر زاڵ دەبن. بۆنموونە ئەگەر نەخۆشێک ناچاربێت کە شلەمەنی وەربگرێت بە مەبەستی چارەسەری، لەوانەیە مێشکی نەخۆش تیشک بخاتە سەر تینوێتی و تەنیا باس لە خواردنەوە بکات. گرفتی سەرەکی ئەم نەخۆشە تینوێتییەو لەوانەیە چەندین جار پرسیار لە پزیشک و پەرستار بکات سەبارەت بە وەرگرتنی شلەمەنی. لەم کاتەدا نەخۆش ئاگای لە دەوروبەری خۆی نابێت. کاتێک کە تینوێتی نەما، ئاگای لە دەوروبەری خۆی دەبێت و بۆ نموونە لەوانەیە داوای ئەوە بکات کە دەوروبەری خەلوەت بکرێت.

## پێویستییەکانی ئاسایش و ئەمنیەت

ئەگەر پێویستییەکانی جەستەیی رازی بکرێن، پێویستی بە ئاسایش زاڵ دەبێت وەک ئاساییشی جەستەیی. مرۆڤ ئاسایی دەتوانێت خۆی بپارێزێت و هەست بە مەترسی ناکات وا دەزانێت لە مەرگ دوورەو ئێشەکەی ئەمنیەتی تێدایە ئەگەر سەلامەتی هەبێت هەست دەکات لەباری ئابووری لە ئاسایش دایە.
نەخۆشی خۆی جۆرە هەڕەشەیەکە کەسی نەخۆش لەوانەیە نیگەران بیت سەبارەت بەو کەسانەی کە دێنە ژوورەکەی و ئەو کارانەی کە ئەنجام دەدەن لەلایەن نەناسراوان تاقیکردنەوەکانی دیاری کردنی نەخۆشی و شێوازەکانی چارەسەری لەوانەیە ببێتە هۆی ترسی نەخۆش. نەخۆش دەیەوێ هەست بە ئاسایش و ئەمنیەت بکات هەرچەندە نەخۆش لەوانەیە ئەم ترسانە دەرنەخات، بەڵام دەیەوێ تیمی تەندروستی ئاگاداری ئەم ترسە بن. بۆ پاراستنی نەخۆش لە مەترسی، پەرستار دەبێ سروشتی نەخۆشییەکەی بزانێت و ئاگاداری هەر گیروگرفتێکی بێت. ئەگەر گیروگرفتەکان روودەن بتوانێت چاودێری زیرەکانە ئەنجام بدات.

## پێویستی پەیوەندبوون و سۆزو خۆشەویستی

کاتێک پێویستییەکانی جەستەیی و ئاسایشی نەخۆش تێرکرا، پێویستی بە پەیوەندبوون بە خەڵکی ترو سۆزو خۆشەویستی سەر هەڵدەدات. هەر تاکەکەسێک نەخۆش یان تەندروست داخوازی هاوڕێیەتی و ناسینی خەڵکە. نەخۆش دەیەوێت پەیوەند بێت بە بنەماڵەی خۆی یان هاوڕێیەک. لەبەرئەوە هەر نیشانەی پێویستی بەهاوڕێ و یاوەر دەبێ جێگای رێزی هەبێت. پەرستارێکی ژیر هەمیشە دەبێ ئاگاداری پێویستی و گرنگی پەیوەندی ئەم بابەتە لەگەڵ ورەی نەخۆش دابێت رێگایەک بۆ گەیشتن بەم مەبەستە یارمەتی دانی ئەندامانی خێزانە بۆ هەست کردن بەوە کە رۆڵێکی دیاری کراویان هەیە لە چاک بوونەوەی نەخۆش هەڵسەنگاندن و لێک دانەوەی رەفتاری نەخۆش کارێکی سەرەکییە بۆ دیارکردنی نیشاندەرەکانی پێویستی بە پەیوەندبوون و سۆزو خۆشەویستی. نەخۆش لەوانەیە بێ دەنگ و بێ گلەیی و بە پەرۆش بێت بۆ داواکردن یان لەوانەیە پێویستی بە ئاوڕدانەوەی هەبێت لە رێگەی رێز لێنانی بەردەوام و پرسیارکردن. بە دروست لێکدانەوەی ئەم رەفتارانە پەرستار دەتوانێت رێگایەک بەکار بێنێت بۆ پێش وەبردنی هەستی نەخۆش بە قایل بوون و پەیوەندبوون. قایل کردنی نەخۆش و بنەماڵەکەی بەوە کە ئەندامانی گرنگی

تیمی چاودێری تەندروستین، هەدەفێکی بایەخدارە.

### پێویستی بەڕێز و ڕێزداری

مرۆڤ بە سروشت بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییەو بێزارە لە تەنیایی و جودابوون. نەخۆشی وا لە مرۆڤ دەکات کە لە ژیانی ئاسایی دونیا جیاببێتەوەو بکەوێتە ناو بارودۆخێکی نامۆ، بارودۆخێک کە نەویستاوەو نائاشنایە، و لەناوی دا هەست بە نەشارەزایی و تەنیایی دەکات. بەتایبەت ئەو کاتە کە پێشتر ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵگە بووەو ئێستاش پێویستی بە خەڵکی تر هەیە. ئەم نەخۆشە پێویستی بە پاراستنی ڕێزداری هەیە. پێویستی بەوەی هەیە کە وەک تاکەکەسێ بناسرێت بە کەسایەتیەکی تایبەت. ئەو پەرستارە کارامەی کە لە مانای بەهاداری تاکەکەسی و شکۆی مرۆڤ تێ گەیشتبێت ئەم پێویستیە جێبەجێ دەکات. ئەو مەجال دەداتە نەخۆش کە قسەبکات و لەگەڵیدا بە گفتوگۆ دادەنیشێت و ئارەزووی خۆی پیشان دەدات بۆ بینینی هەموو ئەو بابەتانەو بیرکردنەوەکانی ئارەزووی خۆی پیشان دەدات بۆ بیستنی هەموو ئەو بابەتانەو بیرکردنەوەکانی کمە دەزانێت گرنگن بۆ نەخۆش. هەروەها سۆزی خۆی پێشان دەدات بۆئەوەی کە هەست بەڕێزلێنان بکات و لەئەنجامدا پێویستییەکان و گیروگرفتەکانی بزانێت. نیشانەکانی پێویستی بەڕێزو ڕێزداری هەستکردن بەئەسیربوون و نەبوونی دڵگەرمی و شایستەیی و توانایییە. فێرکردنی نەخۆش کە جەخت دەکاتە سەر بەدەست هێنانی شارەزایی و زانایی نەخۆش دەتوانێت یارمەتیدەربێت بۆ زیادکردنی هەست بەڕێزداری نەخۆش.

### پێویستیی بەگەیشتن بەراستەقینەی خۆی

ماسلۆ قرساندوویەتی کە تەنیا ١٪ کەسانی بالق دەگەنە ئاستی داواکردنی گەیشتن بە راستەقینەی خۆیان، ئەمە بۆ ئەو کەسانە ممکن نییە کە زۆر هەژارن یان لە سۆزو هەڵچوون دوورن. هەروەها زۆربەی خەڵک بەجێ گەیشتنی پێویستییەکانی ئاستی خوارەوەی سێ گۆشە، رازی دەبن و هەوڵ نادەن بگەنە ئاستی گەیشتن بە حەقیقەتی خۆیان.

### پێویستی بە تەواوبوون

کاتێک کە پێویستییەکانی جەستەیی نەخۆش بەجێ دێت و هەستی بەئاسایش و رێز کرد، پاڵنەرەکانی داهێنەر بەگڕ دەکەون. ئەگەر مانەوەی نەخۆش لە نەخۆشخانە کورت بێت نابێت بێ ئومێد بین لە بەجێ گەیشتنی ئەم پێویستییە بەڵام ئەگەر نەخۆشێک زۆر بخایەنێت دەبێ نەخۆش دڵنیا بکرێت کە مەجال دەبێت بۆ باس کردن لە پاڵنەرە داهێنەرەکانی دەروونی و هەست کردن بە سوودمەندی.
پێویستی بەزانین و تێ گەیشتن ئەم پێویستییە پاڵنەرێکی بەهێزە. کەسی ژیر لە دوای زانیاری دەگەڕێت و لەناو مێشکی ڕێک دەخات و شی دەکاتەوەو لەدوای ماناکانی دەگەڕێت. بەگشتی نەخۆشەکان دەیانەوێ بزانن چی بۆیان دەکرێت و ئەوانیش ناگەنە هیچ زانیارییەک چونکە روونکردنەوەکان زۆر جار یان کورتن یان نادیارو ئاڵۆزن. زۆربەی نەخۆشەکان زانیاری سەرسوڕمانیان هەیە لە کارەکانی جەستە. بەهەرحاڵ لەوانەیە هەندێکیان زانیارییەکانیان دروست بیت و هەندێکیانیش زانیارییەکانیان هەڵەیەو پێویستە ئەم زانیاریانە راست بکرێن و بۆیان روون بکرێتەوە پێدانی زانیاری بە نەخۆشەکان بەرپرسیاریەتی پەرستارەو فێرکردنیان یەکێکە لە کارەهەرە گرنگەکانی پیشەی پەرستاری. بۆ فێرکردنی راست و کاریگەر، پەرستار دەبێ زانیاری هەبێت سەبارەت بە بابەتەکەو کارامەیی هەبێت لە چۆنیەتی گفتوگۆکردن و میکانیزمەکانی بنەڕەتی فێرکردن و راهێنان. کاتێک کە بە کورتی و سادەیی شتێک بۆ نەخۆش روون دەکرێتەوە لە هەمان کاتیشدا دەبێ مانادار بێت کە نەخۆش پێ قایل ببێت. باری جەستەیی و دەروونی نەخۆش و زیرەکی و ئەزموونەکەی و ئاگاداربوون لە دەوروبەر وەک زەروورەتی پێویستی بە زانین و تێ گەیشتن دەبێ رەچاو بکرێت.

### پێویستی بە جوانی و قەشەنگی

پێویستییەکانی جوانی و قەشەنگی لە کەسێک بۆ کەسێکی تر زۆر جیاوازە. بەڵام بۆ هەموو نەخۆشەکان بەسوودترین بارودۆخ و دەوروبەر ئەوەیە کە هەم ڕێک و پێک و هەم جوان بێت. ئەو نەخۆشەی کە هەستێکی ناسکیان هەیە بەرامبەر بە جوانی کاتێک کە دیمەن و رەنگی نارێک و بۆنی ناخۆش و ئاشوب و بێ نیزامی دەبینن نیگەران و ژێر فشار دەبێت لەوانەیە ئەو بەپەرۆش بێت بۆ گوڵ و پەرتووک یان موسیقاو هەواری خۆش و ئەگەر ئەوانە بۆی فەراهەم بکرێت بێ نیهایەت کاریگەری لەسەر چاک بوونەوەی دەبێت.

**تێبینی:** لە ئەنجامی ئەم گفتوگۆیە، لەوانەیە ئەوە دەربکەوێت کە زۆربەی پێویستییەکانی تاکەکەس، نەخۆش یان ساخ لەوانەیە هەندێکی رازی بکرێت و بەجێ بێت و وێڕای ئەمە، ئەو پەرستارەی کە بەرپرسیارو تایبەتە بە یارمەتی دانی نەخۆش لە کاتی رووبەڕووبوون بەم پێویستیانەو گرفتەکانی، دەبێ ئەم حەقیقەتە بزانێت کە هەندێک گرفت نە لادەبردرێن و نەچارەسەر دەبن. کاتێ رووبەڕووبوون بەم جۆرە گرفتانە رۆڵی پەرستار یارمەتی دانی نەخۆشە بۆ راهاتنێکی پێ گەنیو و مەبەست دارو قەرەبوویی بۆ مانەوەی هەمیشەیی یان چارەیەک بۆ ئەم گرفتانە.

# دەرچووانی کۆلێژی پەرستاری و گەشتی وڵاتی ئێران

لەسەر ئەرک و راسپاردەکانی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەمەڕ باشتر کردنی سیستەمی تەندروستی لە کوردستاندا بەگەشتێکی سێ مانگی کۆمەڵێک لەدەرچووانی کۆلێژی پەرستاری لە رێگای وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ ئاگاداربوون لە سیستەمی وڵاتانی دراوسێ بەتایبەتی زانستی پەرستاری رەوانەی وڵاتی ئێران کران و لەو سەردانەیاندا لەشاری (ورمێ)مانەوەو سەردانی زۆرێک لە نەخۆشخانەو بنکە تەندروستییەکانیان کرد. دوای گەڕانەوەشیان ئێستا لە نەخۆشخانەی رزگاری بەشداری لە خولی (چاکسازی خزمەتگوزاری پەرستاری) هاوشان لەگەڵ پەرستارانی تری نەخۆشخانەکە دەکەن. کە مەبەستیان زێتر خزمەتکردنی نەخۆش و پیشاندانی ئاستی پەرستاری و گۆڕانکاری لە سیستەمی تەندروستی بەشێوەیەکی گشتی. بۆ ئاشنابوون لەو گەشتە کۆمەڵێ لەو پەرستارانەمان دواند:

ریپۆرتاژ: دیلمان سەلاح-رزگار عەبدولرەزاق

**سەرەتا بەڕێز (ئاراس رەسول) سەبارەت بەشێوازی کارکردنی پەرستارو چۆنیەتی دانانی رێوشوێنی سیستەمی پەرستاری وتی:** شێوازی کارکردن لەوێ جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ ئێرە لەبەشی (بووژانەوەی دڵ) لەوێ پانزە نەخۆش هەبوو لەژێر چاودێری (٦-٧) پەرستار و یەک هێدنێرس بۆ هەر شەفتێک هەر پەرستارێک لە (٣-٤) نەخۆشی زیاتر وەرنەدەگرت هەر نەخۆشێکیش ئامێرو کەلوپەل و فۆرمی تایبەت بە خۆی هەبوو، نەدەکرا بەهیچ شێوەیەک ئامێری نەخۆشێک بۆ نەخۆشێکی تر بەکار بێت بۆ نموونە ئامێری نەخۆشی شەکرە، هەروەها ئەو ئەزموونانەی یاخود ئەو فۆرمانەی کەلای نەخۆش هەبوو هەموو ئەو گۆڕانکارییانەیان تێدا تۆمار دەکرا کە بەسەر نەخۆشدا دێت هەروەها فۆرمی تایبەت بەڕاپۆرتی پەرستاری تێدابوو تاکو لە کۆتایی دەوامی خۆی ئیمزا بکات و هەموو حاڵەتەکانی باشی و خراپی نەخۆش تۆمار بکات بۆ ئەوەی لە رووی یاساییی ئەگەر ئەو نەخۆشە هەرشتێکی بەسەر هات لەدوای ئەو بەرپرسیار نەبێت ئەوەی تێبینیمان کرد لەبەشی بووژانەوەی دڵ پزیشکی نیشتەجێی خولاو نەبوو تەنها پزیشکی پسپۆڕو پەرستاری زانکۆ و پزیشکی سرکەری لێبوود.





• **دواتر خاتوو (کوێستان حەمە سلێمان) هەر سەربارەت بەسیستەمی تەندروستی بۆ کاری پەرستاری لە وڵاتی ئێران وتی:** سیستەمی تەندروستی ئێران لە زانستی پەرستاریدا جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ ئێرە پەرستارەکان هەریەکەو کاری تایبەتی خۆی هەبوو ئیش و کاری پەرستاران جیاوازی هەبوو لەگەڵ ئیش و کاری پزیشکانی پسپۆڕو نیشتەجێی دێرین و خولاو زۆربەی ئەو ئیشانە لێرە پزیشکە نیشتەجێیەکان ئەنجامی دەدەن لەوێ کاری پەرستارانە.



• **لە وڵامی چۆنیەتی مامەڵە کردنی هاوڵاتی لەگەڵ پەرستاران و پەرستاران لەگەڵ هاووڵاتی خاتوو (ئەڤین ئیسماعیل) بەم شێوەیە بۆمان هاتە دوان:** سەرەتا پەرستاران لەگەڵ هاووڵاتی وەک یەک خێزان وان زۆر بە میهرەبانییەوە هەڵسوکەوت و گفتوگۆ لەگەڵ یەک دەکەن بەتایبەتی کاتێک کە پەرستار لە نەخۆش نزیک دەکەوێتەوە وەک بڵێی لەگەڵ دایکی یاخود خوشکی یا برای لەگەڵ نەخۆش دەدوێت بەپێچەوانەوەش پەرستار زۆر بەڕێزو بەرز سەیر دەکرێت لەلایەن نەخۆش و هاوڵاتیان لە ماوەی ئەو سێ مانگەدا نەمبینی پەرستارێک رووی گرژ بکات لە نەخۆش یاخود تووڕە بێت، جاری واهەبوو نەخۆشێک یەک پرسیاری بۆ چەند جار ئاراستەی پەرستارێک دەکرد پەرستارەکە هەستی بەبێزاری نەدەکرد بە بەرامبەر نەخۆشەکە، ئەو شێوازی مامەڵەکردنی پەرستاران وای کردبوو، هاوەڵی نەخۆش پێویست نەبوو لەلای نەخۆش بێت.



• **لەماوەی مانگێکی خولی چاکسازی لە نەخۆشخانەی رزگاری بە مەبەستی گۆڕینی سیستمی پەرستاری خاتوو (سویدا بەهائەدین) بەم شێوەیە گەشبین بوو:** ئەو ئیمکانییەتەی کە لەئێران هەیە لێرە ئێمە لەژێر دەستمان بێت دەتوانین تارادەیەکی زۆر باش ئەو سیستەمە بگۆڕین ئەو

سیستەمەی کە ئێستا لە کوردستان هەیە گۆڕانکاری بەسەردا دێنین بەڵام ئەگەر بێتو دەسەڵات یاخود وەزارەتی تەندروستی و لایەنە پەیوەندارەکان خەمخۆربن و هاوکاریمان بکەن ئەوا زیاتر دەتوانین بەهۆی گۆڕینی سستەم خزمەت بە گەلی خۆمان بگەیێنین، پەرستاران بەسێ شەفت دەوام دەکەن وەک ئاگادارن تەنها بۆ شەفتی بەیانیان ئوتومبیلێکی تایبەت گیراوە کەچی شەفتی ئێواران و شەو لەسەر حیسابی خۆیان هاتوچۆ دەکەن، هەروەها جل و بەرگی تایبەت بە نەخۆش گرنگە.



**• هەروها پەرستار هێمن کەریم سەبارەت بەو سوودانەی کە لەو خولەدا لە وڵاتی ئێران فێرکران بۆ چۆنیەتی ئەنجامدانی کاری پەرستاری وتی:** سودێکی زۆرمان وەرگرت لە ماوەی ئەو سێ مانگەی سەردانمان بۆ وڵاتی ئێران، هاوکاری پەرستارانی ئەوێ بۆ ئێمە شایەنی باسکردنە بەڕاستی زۆر بەڕێزەوە پێشوازیان کردین، لەبەشی ICU, CCU، ئیمێرجنسی کارمان کرد پاراستنی هەوکردنی برین گرنگییەکی زۆری پێدەدرا دیاری کردنی ئیش و کار هۆکارێک بوو بۆ بەرز نرخاندنی کاری پەرستاری بۆ نموونە لێرە ئەگەر پەرستارێک بیەوێت سۆندەی گەدە دابنێت دەڵێن ئەوە ئیشی (پزیشکی نیشتەجێیە) کەچی لە راستیدا ئەرکی پەرستارانە، لە هەردوو بەشی CCU. ICU زۆربەی پەرستاران دەرچووی کۆلێژ بوون کاریان تیادا دەکرد لە کۆتاییدا دەڵێم زیادبوونی ژمارەی دەرچووانی کۆلێژی پەرستاری و دامەزراندنییان لە نەخۆشخانەکان گرنگە بۆ گۆڕینی سیستەمی تەندروستی لەبواری پەرستاریدا.



**• هەروەها خاتوو (سروە ڕۆستەم) وتی: سەبارەت بە ڕۆڵی ئەوان لە گۆڕینی سیستەمی پەرستاری لەدوای گەڕانەوەیان لە ئێران، گوتی:** سوپاستان دەکەم بۆ ئەو ریپۆرتاژە کە ئەنجامی دەدەن و زۆر گرنگە و زۆر سوپاسی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەم کە لە مانگی ٤/٥/٢٠٠ ئێمەی رەوانەی وڵاتی ئێران کرد بە مەستی مەشق کردن و زیاتر شارەزابوون لە سیستەمی پەرستاری، بەڕاستی سیستەمێکی جوانیان هەبوو سەرەتا بەشێوەیەکی تیۆری چووینە ناو کارەکان دواتر بەشێوەی کردەیی هەڵساین بە ئەرکەکانمان شان بەشانی پەرستارانی ئەو وڵاتە ئێستاش بەو نیازەین ئەو زانیارییانەی لەوێ بەدەستمان هێناوە لە وڵاتی خۆشمان پەیڕەوی بکەین بەهاوکاری هەموو لایەک بەشێوەیەکی تاقیکردنەوە بۆە اوەی مانگێک لە نەخۆشخانەی رزگاری لەگەڵ گشت پەرستارە بەڕێزەکان هەوڵ دەدەین ئەو سیستەمە بگۆڕین بە پاڵپشتی حکومەتی هەرێم و مامۆستا بەڕێزەکانمان بەڵام نووسینی حاڵەتی باش و خراپی نەخۆش لەسەر فۆرمە تایبەتەکان گرنگە لەلایەن پەرستارانەوە کە ئەنجامی بدەن بۆئەوەی لەکاتی پێویستی بەرگری لە خۆی بکات.



**• دواتر پەرستار خاتوو (ئەڤین فەتاح) لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئایا چیان لە هەگبەدایە پاش گەڕانەوەیان لە وڵاتی ئێران بۆ گۆڕینی کاری پەرستاری وتی:** ئەوەی گرنگە دەبێت حکومەت لە ڕێگای وەزارەتی تەندروستی هاوکاریمان بکات بۆ دابین کردنی پێداویستی خزمەت گوزاری پەرستاری، ئەوەی ئێمە خوێندمان لە کۆلێژ زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو کارە کردەییانەی کە لە رووی پەرستارییەوە لە نەخۆشخانەکانی کوردستان دەکرێت، ئێمە دوای دەرچوونمان لە کۆلێژ سەردانی نەخۆشخانەکانی وڵاتی ئێرانمان کرد کە بینیمان چۆن کاری پەرستاری جێبەجێ دەکرێت جا ئەگەر بمانەوێ ئەو سیستەمە لە کوردستان جێبەجێ بکرێت بەتەنیا ناتوانین بەڵکو دەبێ پەرستارانی پەیمانگەو ئامادەیی و ئەوانی تریش بەیەکەوە کار بۆ ئەوە بکەین ئەو سیستەمە پەیڕەو بکەین بۆیە لێرەدا داوا لە پزیشکانی خولاو دەکەین کە ئەو کارانەی کاری پەرستارانە ئەوان ئەنجامی نەدەن چونکە زۆر کار هەیە ئەوان دەیکەن کەچی کاری پەرستارانە لەم ڕێگایەوە داواکارم خولی جۆراوجۆر بۆ سەرجەم پەرستاران بکرێتەوە بۆ هەموو ئەوانەی کە کاری پەرستاری دەکەن و پێویستە ئەو خولانە بەردەوام بێت.

**• لە کۆتاییدا پەرستاری کۆلێژ (عزەدین کەمال) سەبارەت بەم سەفەرەی ئێران بۆ مەبەستی بینینی کاری پەرستاری وتی:**



ئێمە وەک دەرچووانی کۆلێژی پەرستاری بە مەبەستی ئاشنا بوون بە چۆنیەتی کارکردن و سیستەمی پەرستاری لە وڵاتی ئێران سەردانی ئەو وڵاتەمان کرد، وەک ئاشکرایە سیستەمی پەرستاری ئێران لە سیستەمە باشەکانی پەرستاری هەژمار دەکرێت، بۆیە توانیمان سوود لەو ئەزموونە وەربگرین دەخوازین بتوانین ئەو سیستەمە لە وڵاتی خۆمان پیادە بکرێت دەمانەوێ نەک لە روانگەی تەندروستییەوە بەتەنها هاوکاربین بەڵکو دەمانەوێ لەبواری رۆشنبیری و کۆمەڵایەتیشەوە هاوکاری هاووڵاتی و نەخۆش بین و پێویستیشمان بەکات دەبێت بۆ گۆڕانکاری بنەڕەتیانە بۆئەوەی لە سیستەمی تەندروستیدا پیادە بکرێت.

# ڕۆڵی پەرستار لە ڕۆشنبیری تەندروستی ناو کۆمەڵدا

مامۆستا کەریم فەتاح عەزیز

ئاشکرایە کە لەناو کۆمەڵی ئێمەدا تەنگژەی ڕۆشنبیری تەندروستیمان هەیە هەر ئەمەش هۆکارێکە بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و بەئاسانی نەتوانین کۆنترۆڵی بکەین. بۆیە هەبوونی ڕۆشنبیری تەندروستی لە نێو هەموو ئەندامانی کۆمەڵدا پێویستییەکی گرنگە بە تایبەتی لەسەردەمی ئەمڕۆماندا. هەموو ئەندامانی کۆمەڵ وەکو خاڵێکی هاوبەش، هاوبەشن لە ڕۆشنبیری تەندروستیدا. سیستەمی نوێی تەندروستی جیهانی زیاتر گرنگی دەدات بە لایەنی ڕۆشنبیری تەندروستی و خۆپاراستن چونکە هەمیشە خۆپاراستن چاکترە لە چارەسەرکردن. لە وڵاتی خۆماندا کە هاوین و بەهار هات چەند نەخۆشییەک سەرهەڵدەدەن وەک تای ماڵتاو تایفۆئیدو هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی viral hepatitis و سک چوونی هاوینەو ڕشانەوە لە منداڵاندا ئەمانە هەمووی گرفتی تەندروستین و ئەرک دەخەنە سەر نەخۆشخانەکان، بەڵام ئەگەر ئاستی ڕۆشنبیری تەندروستی خەڵک بەرز بێ بەتایبەتی ئەوانەی لە چێشتخانەو شوێنە گشتییەکان کاردەکەن و خاوەن مەڕو ماڵاتەکان کەبەروبوومی شیرمان بۆ ئامادە دەکەن و ئافرەتانی سک پڕو ئەو دایکانەی شیر دەدەن بە منداڵ... هتد جا ئەگەر توانیمان ئاستی ڕۆشنبیری تەندروستی هەموو ئەمانە بەرز بکەینەوە بێگومان ئەم گرفتە تەندروستییەیان ڕوو لە کەمی دەکات. جا بۆیە پەرستار دەبێ ڕۆڵی فێرکەری تەندروستی ببینێ لەو شوێنەی کاری لێدەکات بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێ لەو بیرە تەسکەی کە دەڵێ کاری پەرستار تەنها دەرزی لێدان و تیمارکردن. بۆیە پەرستار دەبێ بچێتە ناو کۆمەڵ و لەبوارە جیاجیاکاندا هەبوونی پێویستە وەکو کارگەو قوتابخانەو زانکۆو پەیمانگەو...هتد بۆئەوەی ئاستی ڕۆشنبیری تەندروستی بەرزبکاتەوە لەناو کۆمەڵدا، چونکە ئەگەر ئەم لایەنەی فەرامۆش کرد واتە ڕۆڵێک لە ٥ ڕۆڵەکانی پەرستار فەرامۆش کراوە. ئەنجامدانی ئەم کارانە بە هەماهەنگی دەبێت لەنێوان کۆمەڵەمان و دامەزراوە تەندروستییەکانی هەرێمی کوردستان.



## پزیشکی برینکاری (ریتشارد کارمۆنا) بیروبۆچوونێکی باشی هەیە دەربارەی پەرستاریی

ئامادەکردنی: گۆڤاری پەرستار

لە ڕۆژی هەینی ٢٠٠٦/٦/٢٣ دا لە کۆنفرانسی نەتەوەیی ٢٠٠٦ دا، (جۆرج بوش) ی سەرۆکی ئەمریکا (ریتشارد کارمۆنا) ی پزیشکی برینکاریی وەکو پەرستارێکی پێشوو بە ئامادەبووەکان ناساند. وەکو کاردانەوەیەک بۆ ئەو ناساندنە (د. ریتشارد) ووتی من هێشتا لە دڵمەوە پەرستارم هەروەها ووتی (کەسێک پەرستار بێت ، هەردەم پەرستارە). د. ریتشارد لە ساڵی ١٩٧٩ لە قوتابخانەی پزیشکیی کالیفۆرنیا دەرچووەو لە ساڵی ٢٠٠٢ نازناوی پزیشکی برینکاریی گشتیی وەرگرتووە. پەرستارە یاساییەکان Nurses Registered ئەم کۆنفرانسەیان بۆ مەبەستی بەرەوپێش بردنی کاری ١١٥٠٠٠ پەرستاری یاسایی لە ئەمریکادا سازکرد کە لەم کۆنفرانسەدا سیستەمی بایەخدانی تەندروستی Sys- care Health tem ئامادە کرا بۆ داهاتووی ئەمریکا. د. ریتشارد لە درێژەی ووتەکەیدا ووتی من فەرمانبەرێکی بەتەمەنم و خاوەنی گەورەترین ئەزموونم لە جیهاندا، هەروەها وەکو ئەکادیمییەک ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە خۆپاراستن و ئامادەکاریی تەندروستی کاری سەرەکیی تەندروستین لە ئەمریکادا، هەروەها ووتی: من لە تەمەنی ٦ ساڵیدا بی ماڵ بووم و بی بایەخدانی تەندروستی بووم و دایکم یارمەتی فیدراڵیی نەدەویست. خەڵکی ئێستا لە توانایاندا هەیە کە خۆیان لە چەندەها گیروفتی تەندروستی بپارێزن ئەویش بەهۆی زیاتر ڕۆیشتن و کەمتر خواردن و کەمکردنەوەی هۆکارە مەترسیدارەکان. هەروەها پێویستییان بە لێپرسینەوەی خۆیان هەیە. لە کاتێکدا کە ناوبراو دانی بەوەدا نا کە کاتی ئێستا کاتێکی باشە بۆ پەرستارە یاساییەکان.

# پەرستاران فریشتەی میهرەبانین...

هەڵبەت گەورەترین بوار لە ژیانی مرۆڤایەتیدا کە بۆتە فاکتەرێکی بەهێز لەسەر ژیانی ئادەمیزاد بواری تەندروستییە، بێگومان بواری تەندروستییش دوو لایەن لە خۆوە دەگرێت (پزیشکی و پەرستاری). کە دوو پیشەی پیرۆزو خزمەت گوزارین لەهەمان کاتدا هاوشانن لەگەڵ یەک بۆ ئەم خزمەتکردنە. ئەوانەی ئەم ئەرکە دەبینن گەلێک زۆرن ئەو کەسانە، هەمیشە لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا بەچاوێکی پڕ ڕێزو خۆشەویستی سەیریان دەکرێت، ڕۆڵی ئەمانەش هەمیشە لەبەر چاوە بەتایبەتی لەنێو نەخۆشخانەکان.

**پەرستاری وەک پێناسە**

**(پەرستاری پیشەیەکی پیرۆزو ئەرکێکی مرۆڤایەتییە، لە هەمان کاتدا زانست و هونەریشە).**

**پەرستاران**

پەرستارانیش ئەو کەسانەن کە لە کاتی پێویست و بێ هێزیدا مامەڵە لەگەڵ مرۆڤدا دەکات و ئێش و ئازاری کەم دەکەنەوە.. پەرستار هەر لەسەرەتای ڕووبەڕووبوونەوەی بە نەخۆش هەر لە چرکەی یەکەمەوە تادوایین چرکە چاودێری نەخۆش دەکات و شەو و ڕۆژ پێکەوە دەبەستێتەوە بە شەونخونی ماندووبوونی ئەم ئەرکە پیرۆزە پێشکەش بە کەسی بەرامبەری دەکات..

**ڕۆڵی ئافرەت لە پەرستاریدا**

هەر لەسەرەتای دروستبوونی کاری پەرستاری ئافرەت یان (کچ) ڕۆڵی بەرچاوی تێدا بینیوە، هەڵبەت بەهۆی ئەوەی ئافرەت بەزەیی و سۆز و خۆشەویستی زۆر زیاترە لەپیاو، هەر بۆیە ڕۆڵی ئافرەت زیاتر گرنگی و کاریگەری هەبووە لەسەر ئەم پیشەیەدا..

هەر بۆ ئەم مەبەستە و بۆ بەخێوکردنی منداڵ و لایەنی خێزانداری لەڕووی پێگەیاندن و پاراستن و چاودێریکردنی هەمیشە ئەم ئەرکە لە ئەستۆی (ئافرەت)دا بووە..

یاخود باشترە بڵێین (دایک) ڕۆڵی سەرەکی هەبووە و بۆ ئەم مەبەستە، هەر بۆ نموونە خاتوو (فلۆرانس نایتنگل) کە بە خانمی (چرا) ناسراوە، ئافرەتێک بوو لەسەردەمی خۆی کە سەرتایی دەست پێ کردنی کاری پەرستاری بوو، بێگومان خزمەتێکی باش و بەرچاوی پێشکەش بە منداڵان و نەخۆش و پیرو پەککەوتە و.. بەساڵاچوان دەکرد. هەر لەم ڕوانگەیەوە ئەوانەی کاری پەرستاریان ئەنجام دەدا بروایان وابوو ئەم خزمەتکردنە و ئەم پیشە



موحسین جەمیل خۆشناو

پیرۆزە لە (خودا) نزیکیان دەکاتەوە، لە هەمان کاتدا وەک ئەرکێکی خێرخواز و مرۆڤایەتی سەیریان دەکرد، هەڵبەت لێرەدا دەتوانین بڵێین دروست بوون و سەرهەڵدانی پەرستاری لای ئافرەت، دروست بووە، دوایی پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی کاری پەرستاری پیاویش توانی ڕۆڵی بەرچاوو زیاتر لە ئافرەت ببینێ..

**ڕۆژی پەرستاران**

١٢ی مایسی هەموو ساڵێک ڕۆژی پەرستارانی جیهانە، چونکە لەم ڕۆژەدا

(خاتوو فلۆرانس) لەدایک بووە ئەو ئافرەتەی کە باسمان کرد یەکەم ئافرەت بووە کەوا بەشێوەیەکی زانستیانە کاری پەرستاری ئەنجامداوە. هەر بۆیە ڕۆژی لەدایک بوونی بۆتە ڕۆژی پەرستارانی جیهان. هەڵبەت لە کوردستانی خۆشمان «١٢ی مایس» هەموو ساڵێک پەرستاران چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەن چونکە جەژنی (پەرستارانی کوردستانە) لەم یادەدا لەگشت نەخۆشخانەکان کارمەندانی تەندروستی ئەم ڕۆژە یاد دەکەنەوە لەژێر چاودێری حکومەت و وەزارەتی تەندروستی و ڕێکخراوەکانی پەرستاران..

پەرستاران لەم ڕۆژەدا ئاهەنگی خۆشی دەگێڕن و دیاری ڕێزلێنان لەلایەن حکومەتی هەرێم و وەزارەتی تەندروستی و کۆمەڵەی پەرستاران دا پێشکەش دەکرێت و ڕێز لە خەبات و ماندووبوونیان دەگرێت بەتایبەتی ئەوانەی خزمەتێکی زۆریان ئەنجامداوە لەبواری پەرستاریدا..

## گرفتی پەرستاران

ئەمڕۆ گەورەترین گرفت کە بۆتە ئاستەنگ لەبەردەم پەرستاران کێشەی (کەمی مووچەیە) بەتایبەتی ئەوانەی تازە دێنە دامەزراندن خاڵێکی تر پەرستاران ناتوانن بەئارەزووی خۆیان درێژە بەکاری خوێندن بدەن بۆ وەرگرتنی زانیاری زیاتر لەمەڕ (زانستی پەرستاری) ئەگەر بە وردی بچینە نێو گرفتەکانی پەرستاران بێگومان بابەتێکی تایبەتی دەوێت، بەڵام زیاتر کردنی (مووچە) دەتوانم بڵێم زۆربەی کێشەکانی پەرستاران چارەسەر دەکات و پێداویستییەکانی ژیانیان فەراهەم دەکرێت.

## پەرستاران تاچەند گرنگییان پێدراوە

وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێم گرنگی تەواوی داوە بەلایەنی پەرستاری، ئەمەش بەکردنەوەی چەند قوتابخانە و ئامادەیی و فێرگەی تەندروستی کردۆتەوە بۆ پێگەیاندنی کادری شارەزا و لێهاتوو لەبواری پەرستاری بەتایبەتی کردنەوەی (کۆلێژی پەرستاری) هەروەها دابین کردنی گشت پێداویستییەکانی خوێندن و دابین کردنی کەلوپەلی پێویست لە ڕووی (کرداری و تیۆری)، و بەخشینی پارچە زەوی و دابین کردنی ئۆتۆمبیلی تایبەت بۆ گواستنەوەی کارمەندان لەماڵەوە بۆ نەخۆشخانە و بە پێچەوانەوە..

کردنەوەی دەیان خولی بەهێزکردن لەبواری پەرستاری، ناردنی پەرستاران بۆ دەرەوەی هەرێم بۆ وەرگرتنی زانیاری گشتی پەرستاری.

## کۆمەڵەی پەرستاران

بۆ بەرگری کردن لە ماف و داخوازییەکانی پەرستاران و خزمەت کردنیان بەشێوەیەکی پێویست و گرنگیدان بەبواری پەرستاری کۆمەڵێک کادری شارەزای بواری پەرستاری و هەستان بەدامەزراندنی کۆمەڵەیەک بەناوی (کۆمەڵەی نەخۆشیارانی کوردستان) لە ڕۆژی ١٢ی مایسی ٢٠٠٤ پاشان لە کۆنفرانسی کۆمەڵە بەشێوەکی فەرمی بووبە (کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان) ئەمە بەشێوەیەکی ڕەسمی مۆڵەتی پێدرا لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێم بۆ خزمەتکردنی پەرستاران و پیشەی پەرستاری.

هەڵبەت هەر لە سەرەتای دروست بوونی کۆمەڵەی پەرستاران بە ڕێژەیەکی بەرچاو کارمەندانی تەندروستی بوونە ئەندام و هاتنە ڕیزی ئەم کۆمەڵەیە چونکە هەر کۆمەڵەی پەرستارانە کە گوزارشت لە ماف و داخوازییەکانی پەرستاران دەکات و دەتوانی کێشەکانیان بگەیەنێتە بەرزترین دەسەڵات و چارەسەریان بکات.

## دوا سەرنج

بەشێوەیەکی گشتی باسی پیشەی پەرستاریمان کرد و لەگشت بوار و لایەنەکانی پەرستاری لێرەدا هەوڵ و کۆششی ئێمە ئەوەی بتوانین لە ڕێگای نووسین و ڕاگەیاندن زیاتر گرنگی بدەین بە کارمەندانی تەندروستی و پەرستاران.

هەربۆیە گۆڤاری پەرستاری کە تاکە گۆڤارە بێگومان کە لەلایەنی ڕۆژنامەگەری خزمەت پێشکەش بکات بە پەرستاران. هەر لە ڕێگای ئەم گۆڤارە بەڕێزە هیوادارم کۆمەڵگەی کوردەوارییمان بەچاوێکی پڕ ڕێز و حورمەتەوە بڕواننە پیشەی پەرستاری بەتایبەتی ئەوانەی لەنێو ئەم کارە خزمەتگوزارییە خزمەت پێشکەش دەکەن لە نەخۆشخانەکاندا، هانی زیاتری مامۆستایان و قوتابیان و دایکان و باوکانمان بدرێت کە زیاتر کچانمان ڕووبکەنە پیشەی پەرستاری چونکە کچان زیاتر بەزەیی و سۆز و خۆشەویستییان بۆ نەخۆش هەیەو دەتوانن زیاتر خزمەتی نەخۆش بکەن و ئێش و ئازاری کەم بکەنەوە.. هەربۆیە بە فریشتەی میهرەبانی ناوزەندکراون.

# پەرستارو کۆمەڵگە

زۆرن ئەو کەسانەی کە لە جیهاندا بەرچاوی و دیارن لە گشت بوارە جیاجیاکانی کۆمەڵگەداو ناوو ناوبانگێکی زۆریشیان هەیە، خۆ زۆر جار ئەو ناوبانگەش لە ئاستی کار راپەڕاندن و توانستی کەسی ناو براوەکاندا نییە بەڵکو لەوانەیە لە رێگای خێزان یاخود شوێنی کاردا ئەو ناوە دروست بکەن، کەچی لە پشت پەردەو لە دیوی دووەم دا سوارچاکی هێندە نادیارمان هەیە کە کاروباری رۆژانەی تاکە تاکەی کۆمەڵگە رادەپەڕێنن و کەچی ناوبانگەکەیان لە پێوانەی ماندوبوونیاندا نییە، زۆرن ئەو چین و توێژانە بەڵام ئەوەی گەرەکە لێرەدا باسی بکەم (ناونیشانی بابەتەکەیە) کە ئایا پەرستار لە کۆمەڵگەدا لەچی پلەیەکی خزمەت پێکردن و رێز گیراوی ماندووبوونەکەی دایە، ئایا ئەو ماندوبوونەی کە پەرستار دەیکات ئەو رێزە مەعنەوییەی لێنراوە کە هەست بە ئارامی و دڵنیایی لە کارەکەیدا بکات، پیشەی پەرستاری شان بەشانی پیشەی مامۆستایی بە دوو لە گرنگترین کۆڵەگەکانی بەرێوەچوونی هەر کۆمەڵگەیەک دادەنرێت، لەبەرچاوی هەموو لایەک ئاشکرایەو روونە کە پەرستاران رۆژو شەو لە خزمەتی خەڵکی سڤیل و هەژارو نەدارو دەوڵەمەندو کاربەدەستدایەو بروسک ئاساو بەبێ وچان چارەسەری ئەم نەخۆشانەیان کردووەو بوونەتە پردی پەرینەوەی رزگاربوون لە نەخۆشیەکەو پەڕاندنی دەردوبەڵایەکەی بەیارمەتی شفای خوای پەروەردگار. هەروەها بە تایبەتی لە باروودۆخی ئەمڕۆماندا کە دوژمنانی گەل و وڵاتمان لە زیادبووندان و تیرۆرو تۆقاندن بەرۆکی میللەتمانی گرتووە ئەگەرچی خۆزگەمان دەخواست ئەم کارە تیرۆریانە روویان نەدابوایە کەچی لەدەسەڵاتی ئێمەدا نەبوو لەگەڵ روودانی هەر کردارێکی لەو چەشنە دووبارە پەرستاران سەلماندیان کە لوتکەیان گرتووە لە کێبرکێی خزمەتی کۆمەڵگەو تاکەکانی ئەگەرچی کارکراوە بۆ پەرستاران لەلایەن حکومەت بەڵام لەئاستی داخوازی و ماندووبوونی ئەم سوارچاکە نادیارانەدا نەبووەو ئەوەی داواشکراوە لە مافی پەرستاری زیاتر هیچی تر نەبووە ماندووبوونی پەرستاران بۆ خزمەتی تاکی کۆمەڵگەی





**سلێمان عەبدولهادی**

خۆمان هەر بە مانەوە لە ناودوە نەوەستاوە بەڵکو گەلێک جار لە خراپی ئەو باروودۆخەی ئاسایشی بەغداش شاندی پزیشکی نێردراون بۆ شارەزایی زیاترو بەشداری کردن لە خولە تایبەتییەکان کە (بەندە) یەکێک بۆووە لە هەموو نموونە زۆرەی کە هەیە بەشاند چووین بۆ بەغدا بە مەبەستی بەشداریکردن لە زانیاری لە بواری بووژانەوەی دڵ و چاودێری وردبین کە ئەمەش هەر بۆ زیاتر خزمەت پێ کردنی تاکەکانە، ئەمە نموونەی مشتێک بوو لە خەرواری خزمەتی بەرچاو بێوچان و بەردەوامی پەرستاری و فریشتەو سوارچاکەکانی تەندروستی و ئومێد دەکەین خەڵکی زیاتر لەوەی ئێستا رێز لە پەرستارو پیشەکەیان بنێن چونکە با دڵنیابن کەئەگەر خزمەتی تاکەکەسی پەرستاری تێدایە بەڵام خوێندنی پیشەکەو خودی پیشەکە بۆ خزمەتی ئەوانەو تاکەکان لەژێر سێبەری پر رەحمەتی ئەم پیشەیەدا دەحەسێنەوە، سڵاو لەو خێزانانەش کەهانی منداڵەکانیان دەدەن لە بواری تەندروستی و پەرستاریدا بخوێنن بۆ خزمەتی گەل و وڵاتیان، چونکە تاکەکانی پیشەی پەرستاری سوارچاکی نادیاری کۆمەڵگەن.

# پەرستاران و ڕۆڵیان
# لە ئەکتیڤ کردنی خزمەتی تەندروستی

ریپۆرتاژ: نیوار یەزداوە

**زۆرن ئەوانەی خزمەت بە مرۆڤ دەکەن و لەگەڵ ئیش و ئازارەکانیان تێکەڵ دەبن مرۆڤ ڕوو لە جۆرەها پیشە دەکات بۆئەوەی خەرمانێک بخاتە سەر بژێوی ڕۆژگاری بەڵام زۆرێک لە پیشەکان ئەوەندە پەیوەست نییە بەژیانی مرۆڤ هێندەی ئەوەی پەرستاران هەیانە، هەرچەندە پیشەی پەرستاری وەکو هەموو پیشەکانی تر جۆرێکە لەو پیشانەی کە وەکو پیشەیەکی حکومی مرۆڤ ڕووی تێدەکات بۆ بژێوی ژیانی بەڵام هەڵبژاردنی ئەو پیشە پێویستی بە مرۆڤێکی خاوەن بەزەیی و سۆز هەیە چونکە هەڵسوکەوت لەگەڵ بارودۆخێکی تایبەتیی ژیانی مرۆڤ دەکات ئەویش لەکاتی نەخۆش کەوتنی، ئەو مرۆڤەی خاوەنی ئەو هەست و سۆزە بێت کە بتوانی ئەوپەڕی مرۆڤایەتی خۆی پیشان بدات بەرامبەر بە مرۆڤ دەبێت چ ڕێزێکی لێبگرێت و چۆن پاداشتی بدرێتەوە سەبارەت بەم پرسە چەندین پەستارانمان دواند سەبارەت بە هەموو ئەو پرسیارانەی کە ئایا ئەوانەی پیشەی پەرستاری دەکەن تا چەند لە پیشەکەی خۆیان ڕازین و گرفتەکانیان چین و هەروەها داخوازی و پێشنیاریان چییە بۆئەوەی ئەو پیشەیە ببێتە یەکێک لەو پیشانەی کە لەنێو کۆمەڵگەی کوردی بێتە جێگای ڕێزو بایەخی کۆمەڵگە هەروەکو چۆن لەنێو میللەتانی پێشکەوتوو بەبایەخەوە سەیری دەکرێت بۆ ئەو مەبەستە لە میانەی ریپۆرتاژێکدا چەندین پەرستارمان هێنایە دوان بەم شێوەیەی خوارەوە هەریەکەیان سەرنج و تێبینی خۆیان خستە ڕوو.**

*** سەرەتا خاتوو (خۆخی ڕەسوڵ ڕەسوڵ) وتی:** ئەمە بۆ ماوەی ٣٨ ساڵە من پەرستارم و لە خزمەتدام و لە ساڵی ١٩٨٥ خەڵاتی پیشەییم وەرگرتووە لە بەغداو لە ساڵی ١٩٨٧ لەلایەن شەهید دکتۆر محەمەد باجەلان خەڵاتی پەرستاری نموونەییم وەرگرت لە ڕۆژی جیهانی پەرستاران و لە ساڵی ٢٠٠٢ دووبارە خەڵات کراوم لەلایەن بەڕێز وەزری تەندروستی سارەت بە پیشەیی پەرستاریش من شانازی بە پیشەکەی خۆمەوە دەکەم چونکە هەست دەکەم خزمەتی مرۆڤ دەکەم و لە ئازارەکانیان کەم ددکەمەوەو هەموو کەس پێویستی بەئێمە هەیەو خزمەتمان دیارو بەرچاوە لەبەرامبەر ئەمەشدا داواکارین لە حکومەت و وەزارەتی تەندروستی زیاتر گرنگی بە ڕۆڵی پەستاران بدرێت و ڕێزیان لێبگیرێت بە قەدەر ئەو ماندووبوون و شەونخونیانەی کە پەرستاران بەدەم نەخۆشەوە دەیکەن.

*** دواتر خاتوو (ئاوات ئیسماعیل ساڵح) وتی:** پەرستاران لە وڵاتانی جیهاندا ڕێزو پایەی خۆیان هەیەو خاوەن پێگەی خۆیانن لەنێو کۆمەڵگەدا چونکە پەرستاران ئەو کەسانەن کە ڕاستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا دەکەن و هۆکارێکن بۆ گەڕانەوەی خۆشگوزەرانی بۆ مرۆڤ و چوون و بەرەو تەندروستی باش بۆیە میللەتانی پێشکەوتوو ڕێزیان دەگرن و بەفریشتەیی میهرەبانی وەسفیان دەکەن بەڵام لە کوردستاندا پەرستاران هیچ بەهایەکیان نییە و کارەکانیان هیچ پیرۆزییەکی نییە لای خەڵک بۆیە پێویستە ڕێوشوێنی وابگردرێتە بەر بۆئەوەی تێڕوانینی خەڵک بگۆڕێ و ڕێز بۆ ئەرک و ماندووبوونی پەرستاران دابنرێت بۆئەوەی ئەوانیش هەست بکەن کە کارەکەیان پیرۆزەو جێگای ڕێزە لەنێو کۆمەڵگەدا لەبەرامبەر ئەمەشدا دەبێت سیستەمی تەندروستی وا دابڕێژرێت کە بەهاو دەسەڵات بۆ پەرستاران دیاری بکرێت لەنێو نەخۆشخانەکاندا.

*** هەروەها پەرستار خاتوو (سوهام عەلی محەمەد) لە نەخۆشخانەی هەولێری فێرکردن سەبارەت بە پەرستارو پیشەی پەرستاری وتی:** پەرستار ئەو مرۆڤە هەست ناسک و ویژدان ئامێزو مرۆڤ دۆستانەن کە لەگەڵ ناسکترین بارودۆخی دەروونی و جەستەیی مرۆڤدا ئاوێتە دەبن پیشەی پەرستاری دێرۆکێکی دووروودرێژی هەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا تا گەیشتووە بەم ڕۆژگارەو مرۆڤە بەویژدان و پێشکەوتووەکان هەمیشە ڕێزیان لە پیشەی پەرستاری ناوە، سەرەڕای ئەوەی کە ئێمە شانازی بەپیشەکەی خۆمانەوە دەکەین

داواکاریین لە دەسەلاتی تەندروستی هەولبدەن زیاتر پەرستاری بەرەو پێشەوە ببەن و گرنگی پێبدەن هەروەها داواکارین خەلک بەچاوی رێزەوە سەیری پەرستاران بکەن و دەسەلاتیش بەئەندازەی خزمەتی کردنی پاداشتمان بداتەوە هەروەها داوا دەکەین کە دەزگاکانی راگەیاندن باس لە پیشەی پەرستاری بکەن و بەها پیرۆزەکانی ئەو پیشەیە بەدیار بخەن.

*** هەر سەبارەت بەم پرسەو رۆل و گرنگی پیشەی پەرستاری، پەرستار خاتوو (چیمەن عەلی سالح بەگ) وتی:**

ئەگەر لەرووی مرۆڤایەتییەوە بروانین کام وشەی گران بەهایە ناتوانێت بەرامبەر وشەی پەرستار بووەستێت و هاوشانی بێت.. دەتوانم بلێم هۆکارێکی بەهێزو پیک بەستە لە ژیانی تەندروستی مرۆڤدا چونکە پیشەیەکی زانستی و مرۆڤی و هونەرییە چونکە کاتێک بەکاری مرۆڤایەتیان هەلدەستن دەبن بەنزیکترین کەس بۆ نەخۆش بۆیە بۆ دەرخستنی ئەو رۆلەیان و بەرز راگرتنی پیشەکەیان دەزگاکانی راگەیاندن زۆر گرنگن بۆ بەدیار خستنی رۆلی پەرستاران و بوونیان بۆئەوەی کۆمەلگە رێزیان لێبگرێت و بە چاوی رێزەوە سەیری کارەکانیان بکات بۆ ئەم مەبەستە من پێم باشە بەرنامەیەکی تایبەت هەبێت لە کەنالێکی تەلەفزیۆنی بۆ دەرخستن و تێروانینی کاری پەرستاران هەروەکو چۆن بەرنامەیەک هەیە بۆ پزیشکەکەکان هەروەها ئەو پەرستارانەی کە لێهاتوو چوست و چالاکن لەرووی زانست و زانیاری و بنێردرێن بۆ خولی تایبەت لە دەرەوەی ولات کە زۆر پێویستە سالانە چەند پەرستارێک هەلبژێردرێن و بنێردرێن بۆ ئەو ولاتانەی کە پیشەی پەرستاری تیایدا پێشکەوتووە هەروەها پێویستە خولی تایبەتی زانستی لە نێو نەخۆشخانەکان بۆ پەرستاران بکرێتەوە بۆ راهێنانیان لەسەر ئامێرە پزیشکییەکان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان، داواکاریشین لەرووی بژێوی ژیانەوە زیاتر گرنگی بەپیشەیی پەرستاری بدرێت و رێزیان لێبگیرێت لەنێو دەزگاکانی تەندروستی و کۆمەلگەدا.

*** هەروەها سەبارەت بەم پرسە پەرستار خاتوو (حەسیبە هەمزە) سەبارەت بە پەرستارو رۆلیان لە نێو نەخۆشخانەدا وتی:**

پەرستاران رۆلی سەرەکیان هەیە لەپێشکەشکردنی خزمەتی تەندروستی بە نەخۆش چونکە ئەوان بەدرێژایی شەو و رۆژ ئاگایان لە نەخۆش هەیەو شەونخونی لەگەلیان دەکێشن ئەگەر کەم و کورتییەکیش هەبێت پێش هەموو کەسێک پەنجەی کەم و کوری بۆ پەرستاران رادەکێشن بۆیە ئێمەی پەرستار تووشی زۆر گرفت دەبین سەرەرای ئەوەش لەنێو دەزگاکانی تەندروستی هیچ رۆلێکیان نییەو هیچ رێز لە خزمەت و شەونخونیمان ناگیرێت، تەنانەت ئێمەی پەرستار سالانە رۆژێکمان هەیە بەناوی رۆژی جیهانی پەرستاران ئەو رۆژەشمان بەسەردا تێپەڕ دەبێت بێ ئەوەی هیچ لێبزانین کە رۆژی جیهانی پەرستارانەو لە رۆژی ١٢ی مایسی هەموو سالێک سەرتاسەری پەرستارانی جیهانی یادی ئەو رۆژە دەکەنەوە بەلام لە کوردستاندا ئەو رۆژەمان بەسەردا تێپەڕ دەبێت زۆرێک لە پەرستارانمان هەر نازانین ئەو رۆژە کەی دێ و دەروات، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ گوێ پێنەدانی دەسەلاتی تەندروستی و پشتگوێ خستنی پەرستاران لە هەموو روویێکەوە بۆیە دەخوازین گرنگی بە پەرستاران بدرێت چونکە پێشخستنی کاری پەرستاری و رێز لێگرتنی پەرستاران هۆکارێکە بۆئەوەی جوانترین خزمەت بە مرۆڤ بکرێت کاتێک دێتە ژێر بالی بەزەیی پەرستاران.


خۆخێ رەسول رەسول


اوات ئیسماعیل سالح


سوهام عەلی محەمەد


حەسیبە هەمزە

# پەرستار کێیە؟

سولتان محەممەد جلندی

پەرستار ئەو مرۆڤەیە کە هەردەم لە هەموو مرۆڤێک نزیکتردر بەشەو و بەرۆژ ئامادەیە هەر کەموکورتییەکی جەستەیی و ئێش و ئازاری جەستەی دەروونی هەبێت ئامادەیە گوێی لێت بگرێت و بەسنگێکی فراوان و رووگەشی بەرەو پیری دەچێت و هیچ کاتێک جیاوازی لەنێوان ئافرەت و پیاو منداڵدا ناکات ئەم پەرستارە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا پێی دەوترێت (برین پێچ و سستەر) لە کاتی ئارامیدا سستەر سەرپەرشتی ئافرەتان دەکات و برین پێچ سەرپەرشتی پیاوان دەکات بەڵام لە هەندێ کاتی پێویستدا هیچ جیاوازییەک نییە بۆ سستەر یان برین پێچ بۆئەوەی مرۆڤێک لە مردن یان لە ئێش و ئازار رزگار بکات پەرستار ئەو سستەرەیە ئەو کە هەموو کەموکوڕی جەستەیی و نەخۆشی و بەسەرهاتەکەی لە دڵ و دەروونی خۆی دەشارێتەوەو هەردەم دوعاو نزاو دەکات و فرمێسک دەرێژێ لە ناخییەوە ئاخو و ئۆف دەکات بۆئەوەی مرۆڤێک چاک دەبێتەوە.

هیچ جیاوازییەک نییە لەپەرستارانی کوڕ بن یان کچ لە ئیش کردندا تەنها لە پلەی خوێدنی نەبێت وەک یەکن هەر هەموویان بۆ خزمەتکردنی مرۆڤی نەخۆش خزمەت دەکەن.

پەرستار ئەو کەسەیە پێی دەگوترێت فریشتە یان (ملائکە الرحمە) هەندێ بیروبۆچوون هەیە کە دەڵێن ملائکە تەنها بۆ ئافرەتانە، نەخێر لە قورئانی پیرۆزدا دیاری نەکردووە ملائکە پیاوە یان نا تەنها خالق نەبێت من دەڵێم فریشتەی میهرەبانی ئەو مرۆڤە بەرێزەیە کە باشترین خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکات بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە خوای گەورە لێبوردن کاتی داوە بەو مرۆڤانەی کە نەخۆش ئایا ئەم پەرستارە ملائکە نین کە خزمەتی ئەو نەخۆش ئازیزانە خزمەت دەکەن کە خوا لێبوردنی بۆ دەرچواندووەو خۆی لە هەموو کەس ئاگادارە بەڵام دووعاو نزای هەر نەخۆشێک زووتر بە خوا دەگات ئایا ئەم پەرستارەش بە هەمان شێوە لای (خوای گەورە) نزیکتر نییە، بەڵێ نزیکترە چونکە فەرمانی خوا جێبەجێ دەکات لەسەر گۆی زەوی و بە چەند یاسایەک پەرستار ئاگادارە لە خواردن و خواردنەوەی نەخۆش هەر خواردنێک زیان بەخش بێت رێگای پێنادات و جۆری خواردنی تری بۆ دیاری دەکات.

پەرستار ئاگادارە خەمخۆرە لە شوێن خەوتنی پاوک و خاوێنی لەشی.

پەرستار ئاگادارە لە جۆری ئەم دەرمانانەی بۆ نەخۆش دیاری دەکرێت و کات و ساتێ دەرمانی بۆ دیاری دەکات و فێری دەکات.

پەرستار ئەو کەسەیە بە کەمترین ئازار دەرزی چارەسەر لە نەخۆش دەدات.

پەرستار نەهێنییەکانی نەخۆش دەپارێزی.

پەرستار ئەو کەسەیە لە کاتی دەست لەرزین و کوێری و کەم ئەندامی هاوکاری دەکات لە جل گۆڕین و خواردن و خواردنەوەدا.

پەرستار ئەو کەسەیە ئاگاداری ئاووهەوای ژووری نەخۆشە.

پەرستار ئەو کەسەیە ئاگادارە نەخۆش چ جۆرە هەناسەیەک هەڵدەمژێت.

پەرستار ئەو کەسەیە ئاگاداری ساردی و گەرمی ژووری نەخۆشەو ئاگاداری پلەی ساردی و گەرمی لەشی نەخۆشە.

پەرستار ئەو کەسەیە ئاگاداری دەرچوونی زگی نەخۆش لە رووی رەنگ و بۆنی و جۆری.

پەرستار ئەو کەسەیە ئاگاداری دەرچوونی میزی نەخۆشە لە رەنگ و بۆنی و چەندێتییەکەی.

پەرستار ئەو کەسەیە بە نەرمترین و جوانترین و خاوێنترین کەرەستە لە برینی نەخۆش چارەسەر دەکات.

پەرستار ئەو کەسەیە هەموو نهێنییەکانی نەخۆش دەزانێت لە رووی جەستەیی و دەروونی و کۆمەڵایەتیی.

پەرستار ئەو مرۆڤەیە کە دوژمنی زۆرەو هیچ کاتێک نەترساوەو کۆڵی نەداوەو لە هەموو کاتە ترسەکانی کە بەرەو رووی میللەتی کورد بۆوەو هیچ کاتێک جیاوازی نەکردووەو لە بیروبۆچوونی خودی تاکی کورد بۆئەوەی لەشی ساغ بێت بۆ بەردەوام بوون لە داواکارییەکانی مافی میللەتەکەی کە مرۆڤ لەش ساغ بێت هەنگاوی دروست دەهاوێژێ بەرەو لوتکەی مافەکانی.

پەرستار ئەگەر لەدەست دوژمنی میللەتەکەی رزگاری بووبێت ئەوە هەمیشە دوژمنی سەرسەختی خۆی هەیەو تاکو ژیان مابێت ئەو دوژمنانەش زۆرن وەک نەخۆشییەکانی (سیل و هەوکردنی پەردەی دەماغ و تووشبوون بەڤایرۆسی جگەر) و زۆر جۆرە نەخۆشی ترسناک و نەخۆشی سەردەم ئایدز ئەو ترسناکەیە زۆر ترسناکترە لەوەی کە بەرامبەر تۆپ و تەیارە بووەستێت.

پەرستارو برین پێچ پێشەنگ بووە لە هەموو شۆڕشێک بە تایبەتی لە شۆڕشەکانی ئەیلوول و گوڵان و حزبەکانی کوردی باشوور.

پەرستار ئەو کەسەیە کە زیاتر بناسرێت تەنها لەکاتی لێقەومان دەناسرێت ئەگەر زیاتر پێناسەی بکەین ئەو رۆژەی جەژن بوو لە مانگی شوبات پۆلی گرنگی میللەتەکەمان شەهید و بریندار بوون هەر ئەو پەرستارە خەمخۆرە بوو بە زووترین کات بەهانای شەهیدان و برینداران و کەسوکاریان هاتن بەبێ هیچ جیاوازییەکی کۆمەڵایەتی و ئایینی و حزبی و، عەشایری بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستا هیچ جۆرە دەرماڵەی ترسناکی پێنەدراوە ئەگەر کەسێکی تر بێت ئەوە دارو دیواری بۆ کۆنکرێت دەکرێت خوای گەورە فەرموویەتی ئێوەم دروست کردووەو وەک تاک و وەیان کۆمەڵ بۆئەوەی یەکتر بناسن و هاوکاری یەکتری بکەن بەجوانترین شێوە ئەوە پەرستارەی باشترین خزمەت بە مرۆڤایەتی و میللەتەکەی دەگەیەنێت بەڵام...

# پاداشتێکی کەم

«زۆرن ژمارەی ئەوکەسانەی کە کارێکی کەم ئەنجام دەدەن پاداشتێکی زۆر وەردەگرن بەڵام کەمی ژمارەی ئەو کەسانەی کە زۆر کاردەکەن پاداشتێکی کەم وەردەگرن».. زۆر جار ماندووبوونێکی زۆریش بەڵام هەر سەرزەنشتی دەکرێت و کەسێک ناڵێ دەستان خۆش.. ئەمانیش پەرستاران و کارمەندانی دیکەی تەندروستین.

لەسەرەتای راپەڕینی (١٩٩١) کاتێک سەرجەم دام و دەزگاکانی حکومەت شەرعیەتی نەما.. یا داخران.. یا کاول بوو یا... ئەوسا تاکە شوێن لەدام و دەزگاکانی حکومەت وەکو خۆی مایەوەو دوور بوو لەم هەموو ئەمانە.. بەڵکو زیاتریش توانای خزمەتێکی پڕ لە شانازی پێشکەش بکات بەخەڵکی پارێزراو بوو تەنها نەخۆشخانەکان بوون کە کاتێک پێشمەرگەو خەڵکی دیکەش بەلێشاو و ڕوویان تێ دەکرد بە هۆی زامداربوونیان دڵنیابوون کە کەسانێک هەن خۆ بەختکارن لە خزمەتیاندا وەستاون بۆ سارێژکردنی زامەکانیان. ئەمەو جگە لە زامدارانی چەکدارەکانی حکومەتی عێراقی ئەوسا.. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە پیشەی ئێمە خزمەتی مرۆڤایەتی دەکات بۆیە دەبێ بەوپەڕی مرۆڤایەتییەوە مامەڵەی لەگەڵ دا بکرێت. لەسەر دەسەڵات پێویستە جیاوازی بکات لەنێوان تەندروستییەکان و پیشەکانی دیکە..

بێگومان هەموو لایەک گەواهی دەدەن کەبەر لە راپەڕینیش کارمەندانی تەندروستی ڕۆڵی خۆیان بینیوە شان بەشانی پێشمەرگە کە چ وەک پەرستار چ وەکو پێشمەرگە لە شاخدابوون و چارەسەرو تیماری زامداری پێشمەرگەیان کردووە، ئەمە جگە لە شەڕەکانی ناوخۆو تەقینەوەو هەموو ڕووداوو کێشەکانی دیکەی وڵات.. تاگەیشتە ئەوەی کە لە کاتی پانۆرامای سەربازی لەلایەن هاوپەیمانانەوە بۆ سەر عێراق، لە کاتێکدا کە هاووڵاتییان شاریان چۆڵ دەکرد لە ترسی کیمیاوی و تۆپی بەعسیەکان!! کارمەندانی تەندروستی باکیان نەبوو لە ترس و هەڕەشە.. وەک خۆ بەختکارێک گیانی خۆیان بەلاوەنا تا گەر خوا نەخواستە هەر کارێکی مەترسیدار ڕوویدات بەئەرکێکی پیرۆز هەڵبستن.

جگە لەمانەش کەخەڵکی لە جەژنانەوو ئاهەنگ و گەشت و سەیران دان.. یا لە کاتە ناخۆش و کارەساتەکان.. کارمەندانی تەندروستی لە نەخۆشخانەکاندا خزمەت پێشکەش دەکەن و تەنانەت ئەو کارمەندانەی کە لە مۆڵەت پێدان یان ئەو کات دەوامی فەرمی خۆشیان نییە لەکاتی پێویست ڕوو لە نەخۆشخانەکان دەکەن بۆ بەدەنگەوە چوون و هاریکاری کارمەندەکانی دیکەو خزمەتی هاووڵاتیان.

بەڵام داخەکەم کاتێک کاردەگاتە سەر پاداشت و ماف دان بەخەڵکی و دەست نیشان کردنیان بۆ پلەو پایەی حکومی و شوێنی تریش کارمەندانی تەندروستی لەیاد دەکرێن.. وەکو ئەوەیە بڵێن تۆ ئەرکت لەسەر شانە بەڵام مافت نییە!؟

بۆیە داوا لەسەرجەم دڵسۆزانی وڵات دەکەم کە ڕۆڵ و ماندووبوون و مافی کارمەندان لەبەرچاو بگیرێت چونکە ئەمانە پێشمەرگەی ونن. هەروەها هیوادارم حکومەتی کوردستان هەرچی زووەو کار بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری گەڕانەوەی دەرماڵەی مەترسی بکات و با دەرماڵەی نیشکگری کارمەندان زیاتر بکرێت چونکە لەبەرژەوەندی نەخۆش و هاووڵاتییان بەگشتی دایە چونکە هەرچەندە مافی کارمەندانی زیاتر بدرێت ئەرکی سەرشانیان زیاتر دەبێت و داواکارم لە ڕاگەیاندنەکان تەنها کەم و کوڕییەکان نەبینن لە نەخۆشخانەکان باکەمێک باس لە ماندووبوون و شەونخوونی و دەستی میهرەبانی کارمەندان بکەن.



رزگار نەقشبەندی/ئەندامی دەستەی باڵا

# خوولی چاکسازی خزمەتگوزاری پەرستاری لە نەخۆشخانەی رزگاری

لەگەڵ گۆرانکاری ژیاندا هەموو زانستەکانی بەرەو پێشەوە دەچن زانستێکیش کەپەیوەندی باشی بەژیانی مرۆڤەوە هەیە زووتر و باشتر کار لەسەر ئەو زانستە دەکرێ زانستی پەرستاریش بەیەکێ لەو پێداویستانەی هەموو تاکێ دادەنرێ کە بەردەوام لە پێشکەوتن دایەو خزمەت گوزاری باشی نیشانی تاکەکان دەدات. خولی چاکسازی خزمەت گوزاری پەرستاری لە رێگای ئەو خوولانەی کە ئێستا لە نەخۆشخانەی رزگاری لە هەولێری پایتەخت کراوەتەوە کە تێدا سێ ئەوۆم و یەکەی بوژانەوەی دڵی گرتۆتەوە کە تێدا ستافی ئەو نەوۆمانە لەگەڵ دەرچوانی کۆلێژی پەرستاری کاری تێدا دەکەن. کە رۆژانەو رۆژانی پشووش بەردەوام لە کاردان بۆ مەشق کردن لەسەر سیستەمێکی پێشکەوتوو لە زانستی پەرستاری کە تێدا بەڕێوەبەرایەتی نەخۆشخانەی رزگاری و کۆلێژی پەرستاری سەرپەرشتاری ئەم خوولە لە ئەستۆیاندایە. بۆ ئەم مەبەستە بە چاکمان زانی لە میانەی ئەم ریپۆرتاژەدا چۆنیەتی بەڕێوەچوونی ئەم خوولە بۆ کارمەندانی تەندروستی بخەینە روو.

ریپۆرتاژ: بەختیار ئەمین-دیلمان هەڵەبجەیی


سەعدی عەلی


چنار عوسمان


سەرباز زاهیر


بورهان عەبد

*** سەرەتا (بورهان عەبد) بەرپرسی نهۆمی سێیەمی پیاوان بەم جۆرە بۆمان دوا:** ئێمە ئامادەین بۆ بەرژەوەندی گشتی و تایبەتی هاووڵاتی نەخۆش زیاتر کاتی خۆمان و تواناو قودرەتمان پێشکەش بکەین چاومان روونە کە بتوانین بەهاوکاری ستافەکانی خۆمان و بەو پەرستارانەی کۆلێژییش کە هاوبەش دەبن لەگەڵ ستافەکاندا جوانترین و باشترین ئاستی پەرستاری نیشان بدەین و بەهەموو کەس بڵێین پەرستار گەر کەش و هەوایەکی لەباری بۆ بڕەخسێ لە توانایدا هەیە کاری چاک و خزمەتی باش پێشکەش بکات. دەشخوازم لە ئاییندەیەکی نزیک نەک چەند نهۆمێک بەڵکو هەموو نەخۆشخانە بگرێتەوە.

*** دواتر (سەرباز زاهیر) بەرپرسی نهۆمی یەکی پیاوان دەڵێ:** بە خۆشحاڵیەوە پاڵپشتی ئەو پرۆژەیەین کە ئێستا لە نەخۆشخانەکەمان جێبەجێ دەکرێت بۆ پیشاندانی ئاستی زانستی پەرستاری و خۆشحاڵیشین کە بتوانین سوود لەو پەرستارانە وەربگرین کە سەردانی وڵاتی ئێرانیان کردبوو بۆ مەبەستی مەشق کردن لەسەر زاستی پەرستارو بەهاوکاری کردنی هەردوولامان بە ئاڵوگۆڕکردنی زانستەکە بتوانین خزمەتی هاووڵاتیان بکەین لەمەڕ بەدی هێنانی ژینگەیەکی تەندروستی.

*** پاشان (چنار عوسمان) بەڕێوەبەری بوژانەوەی دڵ وتی:** دڵنیام گەر ئەو پرۆژەیە بەو شێوازەی کە بڕیاری لەسەر دراوە جێبەجێ بکرێت و کار لەسەر ئەو سیستەمە بکرێت دەتوانین خزمەتێکی باش پێشکەش بکەین بە هاووڵاتیان. بەڵام من دەڵێم باشتر وابوو پێش ئەوەی دەست بکرایە بە جێبەجێ کردنی ئەم پرۆژەیە کۆمەڵێ کارو گۆڕانکاری بنەڕەتی هەبوو کە چارەسەر بکرانایە لەوانەی کەمی رەگەزی ئافرەت لە نەخۆشخانەکان و گۆڕانکاری لە سیستەمی تەندروستی بکرایە لە شێوازی دەوام کردن چونکە دەبینی لە نەخۆشخانەیەک بۆ نەخۆشخانەیەکی تر جیاوازە شێوازی (OF) جیاوازە و دەواتر لە نەخۆشخانەکان بە جیاوازی لەگەڵ بنکە تەندروستییەکان کەچی لە موچەشدا وەک یەکن و زیاتر کردنی پارەی ئیشگران کە پێویستی بە زیادکردن هەیە. بەڵام جارێکی تریش دووبارەی دەکەمەوە کە ئەو سیستەمە پیادە بکرێت دەتوانین سەرکەوتووبین و بەشێوازێکی جیاواز لە جاران خزمەت بە هاووڵاتیان بکەین و ئەو پەرستارانەی کە شارەزاییان پەیداکردووە بەرەسمی لە

نەخۆشخانەکان دابمەزرێن.

*** دواتر (ئەمـــام ســـەدیق) بەرپرسی نهۆمی دووەمی ئافرەتان دەڵێ:** کارکردن لەسەر ئەو پرۆژەیەی کە دانراوە بۆ باشتر خـزمـەت کـردنی هاوولاتی و ئێـمـەش بتوانین بەهەموو توانای خۆمان خزمەت بکەین بەو واتایەی کـە ناوی لێنراوە خـولی چاکســازی خـزمـەتی گـوزاری پەرستاری و ئێمەش پێشتریش بەردوام هاوکارو یارمەتی دەری هاوولاتی بووین بەلام بۆ لەمەودوا ئەو شێوازی خزمەتی کـردنە دەگـۆڕێ و بەجـۆرێکی باشـتـرو پێشکەوتووتر لەگەڵیان دەبین ئەم خوولە .راســتـــە مـــاندوو بوونی زیاتری پەرسـتـارانی پێـویسـتـە بەلام گـرنگ ئەوەیە لەبەرژەوەندی نەخـۆشـدا دەبێ ئەمە جێگای خۆشحاڵیە.

*** هەر لە نهـــۆمی دووەمی پیـــاوان (سـەعـدی عـەلی) بەرپرسی نهـۆم بەم شێوەیە هاتە لێ دوان:** خولی چاکسازی کە خزمەت گوزاری پەرستاری بۆ ئێستا دەتوانم بڵـــێم زۆر کـــەڵکی لێ وەردەگیرێت بۆ پێشەوە چوونی ئاستی زانســتی پەرســتـــاران بەتایبـەتی دەرچووانی کۆلێژی پەرستاریش بەشدار لەو پرۆژەیە وەک باقی تری پەرستارانی نهۆمەکانی خۆمان کاردەکەن و بتوانن ئەو زانســتـانەی کە لە مەشقی خۆیان لەشاری ئێران وەریان گرتووە بەهاوکاری هەمــــوو لایەک بگوازینەوە نێـــو نەخۆشخانەکەمان و زیاتریش دەبین لەو سیستەمانەوە ئەو خولە زیاتر پەرستاران لە گەڵ نەخۆشەکان هاوکار دەبن چونکە بۆ هەر چوار نەخـۆش پەرســتـارێ و لە بوژانەوەی دڵـیش هەر دوو نەخــــۆش پەرســتـارێ چاودێری دەکـات کـە ئەمـە بەردەوامـەو لە شـەفـتـەکـانی ئێشـکگر لەسـەر ئەو سـیـسـتـەمـە دەبێ رۆژانی پشووش بەهەمان شێوەیە.



ئەمــیـــرە شــەفــیق



دولبەر عەبدولرەحمان



ئیبــراهیم خـالـیـد

*** (ئیبـراهیم خالید) بەرپرسی نهۆمی شەشەمی پیاوان لەسەر خولی چاکسازی دەڵێ:** هەمـوو سـتـافـەکـانی خـۆمـان ئامادەکردووە بۆ بەرەوپێشچوونی ئەم خوولە بۆئەوەی بتوانین پەرستار باشتر بناسین و کـاروخـزمـەتی پەرســتـاری پیـــشـــانی هەمـــوو کـەس بدەین لە سیستەمی ئەم خوولەدا هاتووە لە یەکەم سات کە داخلی نهۆم دەبین پێشوازی لە نەخـــۆش دەکـــرێت و دوای گـــۆڕین و وەرگـــــرتنی کـــــەلوپەلی لەلایەن پەرستارێکەوە بەوردی چاودێری دەکرێت واتە هاوەڵی نابێ لە نەخۆشخـانە کـە ئێـمـە بڕیاری لێ دەدەین کـە پێـویسـتی پێـیـــە یان نا پەرســـتـــاران جـێگای هاوەڵیش دەگـرنەوە بۆ نەخـۆش لەسـەر ئەو دابەش کـــردنەش کـــە بۆ ســـەر نەخـــۆشـــەکـــان هەیە هەمـــان رێژەی ئەوســـتـــافـــە لە رۆژانی پشـووشـدا هەر ئامادە دەبن و خزمـەت دەکەن شانازیش بەوە دەکەین کە پەرسـتـارین و بتوانین خـــزمـــەتی خـــەڵکی بکەین هاوکـــارو یارمـــەتی دەریان بین لەســـەر کـــەم کـــــردنەوەی ئێش و ئازاری نەخــــۆش هیوامان سەرکەوتنی ئەم خوولەیە لەمەڕ بەرزبوونەوەی ئاســـــتی زانســــــتی پەرستاران.

*** پاشان خاتوو (دولبەر عەبدولرەحمان) لە نهۆمی شەشەمی ئافرەتان بەم شێوەیە بۆمان دوا:** :ەخوازین بتوانین لە جاران باشتر لەماوەی ئەو خوولەدا خزمـەت بە نەخــــۆش بکەین هەرچەندە ئێـــــمـــە پەرستاران بۆ باشی تەندروستی نەخۆش ئەوەی لەسـەر ئێـمـە بووە جێبـەجێمـان کـردووە بەلام لەمـەودوا دوای وەرگـرتنی زانیاری پێشکەوتوو تر لەسەر زانستی پەرستاری زیاتر کاردەکەین و پێشمان خـــۆشـــە نەک چەند نهـــۆمێ بەڵکو نەخـۆشـخـانەکـان هەمـوو بگرێتـەوە نەخـۆشـخـانەی (نموونەییش) بۆ ئەوەی هەمـوو رایەکی سـتـافی تەندروسـتی رێگای پێ بدرێت بە جـوانتـرین شـێـوە خـزمـەت بکات و ئێـمـەی پەرسـتـاران دڵنیـای کـەس و کاری نەخـۆش دەکـەین ئەوەی پێـویسـتی نەخۆش بێت ئێـمـە بۆیان ئامادە بکەین.

*** هەروەها خـاتوو (ئەمـیـرە شـەفـیق) بەرپرسی نهـۆمی سـێـیـەمی ئافـرەتان وتی:** لەگـەڵ ئەوەی سـتـافـەکـانی ئێـمـە پەرستارانی خاوەن ئەزموون و کارامەن بەلام لەم خـوولە چاکـسـازیەشـدا بەدڵ فراوانییەوە چاوەڕوانی ئەو زانیارییانە دەکـەین کــە ئەوان لەســەر زانســتی پەرســتـاری پیـشـانمان بدەن و ئێـمـەش لەسەر ئەو ئەزموونەی هەمانە هاوکاری ئەوان بین بۆ سـەرخـسـتنی پرۆسـەکـەو خزمەت کردنی تاکی نەخۆشە لە هەمان کـاتیـشـدا زیاتر ئاشنابوونە بەلایەنە جیـاجیـاکـانی زانسـتی پەرسـتـاری و راهاتن و مەشق کردن لەو ماوەیدا.

# چارەسەرکردنی خوێنبەربوون
# بە بەکارهێنانی شەپۆلی سەروو دەنگییەکان



سەنگەر محەممەد ئەحمەد

سوپای ئەمەریکی پلانێکی داناوە بۆ دروست کردنی ئامێرێکی تازە شەپۆلی دەنگی تیادا بەکاردەهێنرێت بە مەبەستی چارەسەرکردنی خوێنبەربوونی ناوەوە(INTERNAL BLEEDING )بۆ ئەو سەربازانەی توشی پێکان دەبن لە بەرەکانی جەنگدا.

ئەم ئامێرە تازەیە لە توانای دایە شوێنەپچڕاوەکان لە لوولە خوێنەکانی ناوەوە دیاری بکات و سارێژیان بکات لە کاتی برینداربوونی سەربازەکان بە بێ ئەنجامدانی نەشتەرگەری .

سوپای ئەمەریکی هەوڵی زۆردەدات بۆ بەرەوپێش بردنی ئەم ئامێرە بە شێوەیەک قەبارەیەکی گونجاوو بچوکی هەبێت و سەربازەکان بتوانن بە ئاسانی بەکاری بهێنن.

بە پێ ی راپۆرتێکی سوپای ئەمەریکی ڕێژەی مردنی سەربازەکان لە بەرەکانی جەگدا بە پلە یەک بە هۆی خوێنبەربوونی ناوەوەیە.

گرنگی ئەم ئامێرە لەوە دایە ئەتوانی شوێنی خوێنبەربوونەکە دیاری بکات ، بە ناردنی گورزێکی شەپۆلی سەرویی دەنگی چڕ دەبێتە هۆی داخستنی لوولە خوێنەپچڕاوەکان و ڕاگرتنی خوێنبەربوونەکە .

ئەم ئامێرە بەجۆرێک ئەندازەی کێشراوە کە بە شێوەی قایشێکە بە ند کراوە بە ئامێری شەپۆلی سەروی دەنگی و لە کاتی بەکارهێناندا قایشەکە لە شوێنی پێکانەکە دەبەسترێ.

هەردوو کۆمپانیای (فلیپس) و کۆمپانیای (ئۆگوستس) لە پێشبرکی دانە بۆ خستنە بازاری ئەم ئامێرە پێشکەوتووە، لەم سەروبەندەدا ئاژانسی ئەمەریکی ڕێگەی بەم دوو کۆمپانیایە داوە بۆ پەرەپێدانی و پێشخستنی ئەم ئامێرە و خستنە ژێر دەستی کۆمەڵێک پسپۆری تایبەتمەند پێش ئەوەی بخرێتە بازارەوە .

(ڕاندی سیرولز) سەرۆکی کۆمپانیای (ئوگوستس)لە لێدوانێکی بۆ BBC ڕایگەیاند شەپۆلە سەروو دەنگیەکان ڕۆژانە بە شێوەیەکی فراوان لە بواری چارەسەری شیرپەنجە، شکاندنی بەردی گورچیلە بە کاردەهێنرێت، ئەمەش لە شێوەی سوناری وێنەداری لە پێناوپێک بەستنی ئەم ئامێرانەو گەیشتن بە ئامێرێکی پێشکەوتوو.

لە لایەکی ترەوە ئەم بابەتە تازەیە بۆ ڕاگرتنی خوێن بەربوون بە بە کارهێنانی شەپۆلەسەروو دەنگیەکان بۆتە شتێکی گرنگ و بڕواپێکراو لەلایەنی ئەندازییەوە.

پرۆفسیۆر (لۆرنس کرۆم )لە تیپی لێکوڵەرەوانی کۆمپانیای فلیپس ڕایگەیاند : کە کۆمپانیاکەیان لە تاقیکردنەوەکانیان گەیشتونەتە دەرئەنجامێک لە دیاری کردنی شوێنی خوێنبەربون بە ڕێگەی ئۆتۆماتیکی و وەراگرتنی خوێنبەربوونەکە بە هۆی شەپۆلەسەرودەنگیەکان.

لێکۆڵەرەوان ئەوەیان روونکردەوە کە ئەم پرۆژەیە لە لایەکەوە زۆر ترسناکە بەلام لە هەمان کاتدا سەرکەوتنیشی ئامانجێکی پر بایەخە.

لەم سەروبەندەدا ئاژانسی ئەمەریکی ماوەی ساڵ و نیوێکی بۆ ئەم دوو کۆمپانیایە دیاری کردوە بۆ ئامادەکردنی نموونەی ئەم ئامێرە و خستنە بازاری، وە پیشاندنی لە لە زانکۆی ستانفۆردی ئەمەریکی پاش ١٨ مانگی دیکە.

**سەرچاوە:**
COM. BBCARABIC.WWW

# هەر جارەی دەزگایەکی تەندروستی

**[illegible] گۆڤاری پەرستار**

**لەم گۆشەیەودا هەوڵ دەدەین هەرجارەو سەردانی دەزگایەکی تەندروستی بکەین بۆ ئەوەی لە چۆنیەتی ئیش و کارەکان و پێکهاتەی ئەو دەزگایە خوێنەر ئاگادار بیت و بۆ ئەم جارەش نەخۆشخانەی فریاکەوتنی هەولێرمان بەسەرکردەوە ئەو نەخۆشخانەیە کە (٢٤) کاتژمێر دەرگای نەخۆشخانەکەیان واڵایە بەرووی هاووڵاتیاندا و خزمەتێکی باش و ماندووبوونێکی زۆر لەگەڵ بوونی چەندین کەم و کوڕی هەر لە کۆنی و بچووکی بینایەکەوە دەست پێ دەکات تا کۆمەڵێک کەم و کوڕی تریش کەچی ماندوو نەناسانە کاری خۆیان بەبێ گوێدانە ئەو کەم و کوڕیانە ئەنجام دەدەن و لە خزمەت هاوووڵاتیان دان.**

**سەرەتا بەڕێز (د. حەیدەر سابیر) بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی فریاکەوتن لەمەڕ نەخۆشخانەکە بۆمان دوا:**

ئێمە لە هەر ڕووداوێک دا کە هۆیەکانی جۆراوجۆرن ئامادەین کە پێشوازی لە هاووڵاتیان بکەین چارەسەری فریاکەوتنی سەرەتاییان بۆ ئەنجام دەدەین و هەروەها حاڵەتی تری کتوپڕ لە نەخۆشیەکانی هەناو و (فشار، شەکرە، ڕەبۆ، ماکەکانی تر، ژەهراوی بوون) کە جاری وا هەیە خێزانێک یاخود فەرمانگەیەک بەتەواوی تووشی حاڵەتی ژەهراوی بوون دەبن ئێمە ئەم حاڵەتە کتوپڕانە هەموویان چارەسەر دەکەین کاری پێویستیان بۆ ئەنجام دەدەین زۆرجار خەڵک باسی نەخۆشخانەی فریاکەوتن دەکەن جا بە سلبی دەبێت یان ئیجابی بەڵام با باسی ئەوەش بکەین تەمەنی ئەم نەخۆشخانەیە (١٩٥٧) کەم کەس هەیە کە لەبیری بێت کە دروست کراوە چونکە تەمەنی لە زۆرێک لە خەڵکان کۆنترە کە دروستیش کراوە نەک بۆ نەخۆشخانە بەڵکو وەک بەشی لە نەخۆشخانەیەکی گشتی بووە لە هەولێر ئەوکاتەش ڕێژەی خەڵکی هەولێر (٢٠٠) هەزار کەس بووە ئێستا خۆی لە ملیۆنێک دەدات و ئەو نەخۆشخانەی پێی دەڵێن فریاکەوتن سەردەمانێک بەشی شکان بووەو سەردەمانێک بەشی منداڵان بووەو سەردەمانێک بەشی سووتان بووەو ئێستا نەخۆشخانەی فریاکەوتنە بەداخەوە دەڵێم لەگەڵ ئەو هەموو پرۆژە بیناسازییە پێشکەوتوانەی کە لەشاری هەولێردا هەیە خەم لەوە نەخوراوە کە بۆ ملیۆنێک کەس ئەم نەخۆشخانە بچووکە هەیە سەرباری ئەوانەش شارەکانی تریش سەردانی دەکەن و پێویستیان پێیەتی.



ئێمە ڕۆژانە بە ئامار نزیکەی (١٦٠٠) نەخۆش روو دەکەنە ئەم نەخۆشخانەیە ئەمە بەس نەخۆش جگە لە ڕووداوی ڕۆژانە من ناڵێم تەحەدا دەکەم چونکە کەس بۆی نییە ئەو قسەیە بکات بەڵام هاووڵاتیان و هەموو دەزگا تەندروستییەکان حکومەتیش باش دەزانن و دەبینن کە نەخۆشخانەی فریاکەوتن چەند لە خزمەت هاووڵاتیان دایە، بەڵام بەویژدانەوە شت باس بکات.

ئێمە (٥٠) پزیشکمان هەیە جێگای حەوانەوەیان نییە کەشەوان نازانن بەچی هاتووچۆ بکەن و بچنەوە ماڵ و ئێمە چێشتخانەیەکمان نییە ئێمە باخچەیەکی ساوایانمان نییە بۆ منداڵانی کارمەندان ئێمە گەراجی سەیارەمان نییە کەسێک لە ڕووداوێکدا ئازار بە بڕبڕەی پشتی یان سەرو ملی کەوتبێ دەبێ لە نەخۆشخانەیەکی تر بیپشکنین.

ئەو خزمەتە بەردەوامەش کەدەکرێ بەڕاستی لە ئەنجامی هەوڵ و ماندووبوونی پزیشکان و پەرستاران و کارمەندانی تری نەخۆشخانەکەیە کە وەک پێشمەرگە شەو و ڕۆژ لەم نەخۆشخانەیە خزمەت دەکەن شوێنەکەمان زۆر بچووکەو بیناکەمان زۆر کۆنە کە بەڕاستی حەق نییە نەخۆشخانەی فریاکەوتن بەوجۆرەبێ داوای ئێمەیە کە نەخۆشخانەیەکی فریاکەوتنی گشتی گەورە دروست بکرێت کە پڕ بێت لە خزمەتگوزاری زانستی و پزیشکی و هەموو پێداویستییەکانی تێدابێ کە لە توانای دابێ

خزمەتێکی بەردەوام و باش پێشکەش بکات دیسانەوە دووپاتی دەکەمەوە لەگەڵ هەموو ئەم کەم و کوڕیانە کارمەندانی ئێمە زۆرماندوو نەناسانە کاری خۆیان ئەنجام دەدەن.

راگەیاندنەکانیش لەوانەیە بەویژدانەوە شتیان نەنووسیوە ئەویشمان هەر پێ باشە و سوپاسی ئەوانەش دەکەین ئەو خاوەن قەڵەمانە کە بە ویژدانەوەش دەنووسن ئێمە هەرگیز لە راگەیاندن نەترساوین و خۆمان بەبەشێک لەوان دزانین لە ماڵداو لە فەرمانگەکاندا کێشەو کەم و کوڕی هەر دەبێ بەڵام چارەسەریش دەکرێت سبلیت لە کارکەوتووە لە هەموو دنیاشدا سبلیت لەکار دەکەوێ خۆ تەنها لەلای ئێمە لە کارنەکەوتووە چاکیش کراوەتەوە بەڵام هاووڵاتی بە پەلەیەو ئێمە سوپاسی هەر لایەک دەکەین کە هاوکاریمان دەکات و ئێمە کە پۆستمان وەرگرتووە بۆ خزمەت کردنی خەڵک وەرمان گرتووە بەردەوامیش دەبین لەسەر ئەو خزمەتە.

لەسەر داوای ئێمە ئەو کۆگایانەی کە لە نزیک نەخۆشخانەکەدایە ئێمە وا خەریکی نۆژەن کردنەوەیەن بۆئەوە بیناکەمان هەندێک گەورە بێ زیاتر خزمەتی تێدا بە هاووڵاتی بکەین.

ئێمە مانگانە بەبەردەوام لەگەڵ کارمەندان و پزیشکانی خۆمان دادەنیشین و هەوڵیان لەگەڵدا دەدەین بۆ ئەوەی زیاتر خۆیانو ماندوو بکەن و ئێمەش بەهەندێ ئیجرائاتی ناوخۆ لەسەر میزانییەی نەخۆشخانەکەمان پاداشت و دەرماڵە دەدەینە کارمەندانی خۆمان کە ئەمەش شتێکی رەمزییە بۆ ئەوان. کە ئێمە دەزانین وەک بەڕێوەبەرایەتی نەخۆشخانەی فریاکەوتن بدرێتەوە چونکە لە هەموو پزیشک و کارمەندانی تری نەخۆشخانەو بنکەکان ماندووترن. پرۆژەیەکمان داواکرد کە مانگانە ( ٥٠ ) هەزار وەک هاوکاریەک بدرێت بە نەخۆشخانە نەک بۆ هەموو کارمەندانیش بەڵکو ( ١٠٤ ) کارمەندن ئەوانەی لە بەشی پێشوازییەکان پێشوازی نەخۆش دەکەن کە بڕەکەی دەکاتە ( ٦٠٠٠٠٠٢٥٠ ) شەست ملیۆن و دووسەدو پەنجا هەزار نووسراوە کە راگیراوە لەدوایدا رۆیشتن کەچی دەڵێن ساڵی ئایندە موناقەشەی دەکەین ناشزانین موافەقەی دەکرێ یان نا کە من بەش بەحاڵی خۆم ئەوە بەراست نازانم چونکە کارمەندانێکن کە موستەحەقی ئەوەن لە بەرئەوەی مواجەهەی مردن و برینداری ئەو میللەتە دەکەن.

**دواتر بەڕێز (جمعە خالید) بەڕێوەبەری کارگێڕی نەخۆشخانەکە بەم شێوەیە دوا:** نەخۆشخانەکەمان لەڕووی بیناوە زۆر کۆنە ئەو کات بەپێی پێویستی شاری هەولێر زۆر باش بوو بەڵام بۆ ئێستا ناتوانین بڵێین گونجاوە چونکە زۆر بچووکە پێکهاتەی نەخۆشخانە لەم بەشانە پێک دێت:

لەدوو پێشوازی (پیاوان، ئافرەتان)

بەشی هەناو- بەشی رووداوەکانی پیاوان و ئافرەتان- لەگەڵ دوو هۆڵی نەشتەرگەری لەگەڵ نۆرینگەی دەرەکیشمان هەیە ئەویش لەم بەشانە پێک دێت بەشی تیشک، تاقیگە، بانقی خوێن، هێڵکاری دڵ، بەشی ددان دەرمانخانەی ناوخۆو دەرەکی و جێگای دەرزی لێدانی پیاوان و ئافرەتان لەگەڵ ژوورێکی پزیشکان کە لە بەیانی کاتژمێر (٨) تا (١)ی شەوو نەخۆشی تێدا بەڕێ دەکرێت. و بەشی کۆمپیوتەرو کۆگاو بگۆڕیشمان هەیەو ( ٥٦٤ ) کارمەندمان بەگشتی هەیە کە لەوانە ( ١٧٧ ) پەرستاری کوڕو کچمان هەیە بێجگە لەوان کارمەندی یاریدەدەری تاقیگەو وێنەگری تیشک و کارمەندی هونەری و کیمیایی و بایۆلۆجیمان هەیە کارمەندانی ئێمە بەبەردەوام ئامادە باشن بۆ هەر رووبەڕووبوونەوەیەکی لەناکاو و هەروەها پێشوازی کردن لە کەسانێکی نەخۆش کە بەردەوام کوشارێکی زۆرمان لەسەرە لەبەرئەوەی هاووڵاتیانێکی زۆر روو لە نەخۆشخانە دەکەن وەک ئاشکراشە تاکە نەخۆشخانەی فریاکەوتنە کە لەشاری هەولێردا هەیە لەگەڵ هەموو ئەو ئاستەنگانەی کە هەمانە پێشوازی هاووڵاتیان دەکەین نەک تەنها لەشاری هەولێر بەڵکو زۆرجار رووداوی نەخۆش لەشارو شارۆچکەکانی دەرەوەی هەولێریش روو لە ئێمە دەکەن و ئەو نەخۆشخانەی کە روو لە ئێمەش دەکەن جۆراجۆرن یان ئەوانە تووشی رووداو دەبن یاخود تووشی ئازارێکی لەناکاو یاخود لەبنکە تەندروستییەکان رەوانەی لای ئیمە دەکرێت ئێمەش کاری پێویستیان بۆ ئەنجام دەدەین ئێمە بەپێی توانای نەخۆشخانەکەمان خوولی جۆراوجۆرمان بۆ پەرستاران و کارمەندانی تریش بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانیاریان و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆشدا لە رێگای گۆڤارەکەتانەوە داوا لە حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەم کە خولی جۆراوجۆر بۆ کارمەندان نەخۆشخانەی فریاکەوتن



بکەنەوە بۆ ئەوەی بتوانن ستافەکانمان باشترین خزمەت بکەن ئاستی زانیاریشیان زیاتر بێت و ڕێگاش بۆ پەرستاران خۆش بکرێت بۆ دووبارە خوێندنەوەیان لە کۆلێژو کۆلێژی پەرستاری بۆئەوەی بروانامەی باش لە بواری پەرستاری بەدەست بهێنن.

**پاشان شێخ فازل سەرۆکی پەرستارانی کوڕ دەڵێت:**
ئێمە هەموو کاتەکانی خۆمان تەرخان کردووە بۆ خزمەتی هاوولاتی لەوکاتەی کە خەڵکان سەرقاڵی خۆ ئامادەکردنن بۆ بۆنەو جەژن و یادەکان کارمەندانی ئێمەش ئێشکگرن و خۆیان بۆ هەر ڕووداوێکی لەناکاو ئامادەباشن بۆیە پێویستە دەسەلات بەئەندازەی کارومانددووبوون و کارمەندان و پزیشکانی ئەم نەخۆشخانەیە پاداشتمان بداتەوەو هاوکارمان بن بۆئەوەی زیاتر هەوڵ بدەین و کار بکەن و هاوولاتیانیش ڕێزو خۆشەویستی لە بەرامبەر کارمەندانی ئێمە بنوێنن چونکە ئێمە خۆشەویستی و هاوکاری نەخۆشەکانی ئەوانین و زۆر سوپاسی بەڕێوەبەرایەتی نەخۆشخانەش دەکەم کە بەردەوام هاوکاری و یارمەتی دەری کارمەندانن و نۆژەنکردنەوەو گەورەکرنی نەخۆشخانەکەمان و هێنانی ئامێرو کەل و پەلە پێشکەوتووەکان بۆ ناو نەخۆشخانە داواکاری ئێمەیە.

**گەشاو ئەنوەر سەرۆکی پەرستارانی کچ وتی:**
شەو و ڕۆژ لە خزمەتی هاوولاتیان داین و ئەرکێکی زۆر گەورەمان لە ئەستۆدایە بۆ خزمەتکردنی هاوولاتیان جێگای خۆیەتی کە هاوولاتیانیش یارمەتی دەری ئێمە بن لەکەم و کردنەوەی قەرەباڵغی لەسەرمان بۆئەوەی بتوانین زیاتر خزمەتی کەسەکانیان بکەین و دڵنیاش بن کە ئەوەی لەدەستمان دایە هەموو هەوڵ و کۆششمان بۆ بەختەوەری نەخۆشەکانی ئەوان دەکەین و لێرەشەوە داوا لە دەسەلات دەکەم کە ئاوڕێکی جدی لە نەخۆشخانەی فریاکەوتن بدەنەوە چارەسەری کێشەو گرفتەکانمان بکەن.



**کامەران خالید بەڕێوەبەری خزمەت گوزاری:**
ستافەکانی بەشی خزمەت گوزاری بەردەوام لە کارکردن داین بۆ خاوێن ڕاگرتنی نەخۆشخانەکە چونکە ئاشکرایە بەهۆی ئەو ڕووداوە جۆراوجۆرو قەرەباڵغیەی کەڕوو لە لە نەخۆشخانەکەمان دەکەن پێویستی بە پاککردنەوەی بەردەوام هەیەو لەگەڵ ئەوەی کۆنی بینایەکە کێشەیە بۆ زیاتر خاوێن بوونی نەخۆشخانەکە و بەردەوامیش لە نزیکەوە ئاگاداری ئیش و کاری ستافەکانین بۆیە لە هەر جێگایەک کە گرفتێک ڕوویدا چارەسەری بکەین و هاوولاتیان دڵنیا دەکەینەوە لەپێناو خزمەت کردنی ئەواندا بەردەوام دەبین لەکار.



**سلێمان عومەر بەڕێوەبەری پرسگە وتی:**
دەوامی ئێمە (٤) شەفتە لەماوەی (٢٤) کاتژمێردا بەلام بەردەوام کێشەی ئێمە لەگەڵ هاوولاتیان ئەوەیە کە ئەوان بە قەرەباڵغیەکی زۆر لەکاتی ڕووداو سەردانی ئێمە دەکەن کە ئەمە نەک تەنها لەبەر باری ئەمنی باش نیيە بەڵکو ئەو قەرەباڵغیە کاریگەری لە تەندروستی نەخۆشەکەش دەکات لەناو بەشەکانی نەخۆشخانەوە ئێمە کاتی دیاری کراومان هەیە ڕۆژانە بۆ سەردانی نەخۆش بۆیە داوا لە هاوولاتیان دەکەم کە هاوکارمان بن ئێمە لە خزمەتی ئەواندایین.

**لەسەرکاری ئەم نەخۆشخانەیە چەند هاوولاتییەکمان دواند:**
- **هاوولاتی (شیرین سالح) دەڵێ:** لە ڕاستیدا من ئەمە چەند جارە سەردانی ئەم نەخۆشخانەیە دەکەم ئەگەرچی جێگایەکە زۆر بچووکە بەلام زۆریش قەرەباڵغە خوا هەڵناگرێ زۆرمان یارمەتی دەدەن ماندوو دەبن لەگەڵماندا.
- **هاوولاتی سەردار ئەنوەر وتی:** پڕ بە مانای ناوی نەخۆشخانەکە فریاکەوتنە فریای هاوولاتیان دەکەون و ئەوەی ئەوان قبوڵ نەکەن بەس باشتر وایە لەبەرنامەی حکومەتدا هەبێ چەند فریاکەوتنێکی تر بکاتەوە لە سنووری جوگرافی شار بۆئەوەی دووری شوێنەکە بۆ هاوولاتیان نزیک بکاتەوە.
- **هاوولاتی پیرۆت مەولوود وتی:** جێگاکە زۆر خاوێنە جاران وانەبوو ئیمە نەشارەزاین و خەڵکی گوندین خودا ئاگاداریان بێ چونکە زۆریان ئاگایان لیمانەو دێنە لامان.

# ساتێک لەگەڵ پەرستارانی دێریندا

لەم گۆشەیە هەوڵ دەدەین ئەو پەرستارانە بهێنینە دوان کە ساڵانێکی دوورودرێژیان لەژیانی خۆیان بۆ پیشەی پەرستاری تەرخان کردووەو بۆ ساتێکیش بێزار نەبوون و بەردەوام بوون بۆ خزمەتی هاووڵاتیان بۆ ئەم جارە لە ئەخۆشخانەی هەولێری فێرکردن چاومان کەوت بە پەرستارێکی قسە خۆش و خاوەن ئەزموون لەبواری پەرستاری کە ئەویش (محەمەد نەجمەدین)ە ناسراوە بە (مام قشتۆ) بۆ ئەوەی خوێنەران بەم پەرستارە دێرینە ئاشنابکەین ئەم دیدارەمان لەگەڵ ئەنجامدا..

دیمانە: دیلمان سەلاح

**• محەمەد نەجمەدین کێیە؟**

- خەڵکی هیران و نازەنینم لە ساڵی (١٩٤٢) لە دایک بووم خولیای منداڵی و ئاواتیشم بوو کە بچمە بەشی تەندروستی و لە ساڵی (١٩٦١) پێشمەرگەری شۆڕشی ئەیلوولی مەزن بووم و پێیان وتم ئەوەی دەرچووی شەشەمی سەرەتایی بێت نووسراوێک هاتووە لە مەکتەبی سیاسی دەتوانێت بچێتە خولی پەرستاری ئەوە بوو منیش چوومە ئەو خولەو لە شۆڕشی ئەیلوول بووم بەپەرستار پاشان لە (١١ی ئازار) کە هاتینەوە خولێکی شەش مانگیمان بۆ کرایەوە.

**• بۆ پیشەی پەرستاریت هەڵبژارد؟**

- پیشەیەکی پیرۆزە لەم پیشەیە دەتوانین خزمەتی هەموو کەس بکەین لە خزم و دۆست و بێگانەو دوژمن و دەوڵەمەند و هەژار ئەم پیشەیە پیشەیەکی مرۆڤایەتییە.

* چەند ساڵە پەرستاری دەکەیت و لە چەند جێگە کارت کردووە؟

- نزیکەی (٤٠) ساڵە خەریکی کاری پەرستاریم ماوەیەک لە هیران و نازەنین دواتر لە مەخموور ماوەی (٢٦) ساڵیشە لە شاری هەولێرم.

**• پەرستارو پێشمەرگە دوو پیشەن کە خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکەن لەلای مام قشتۆ لە کوێدا یەک دەگرنەوە؟**

- پێشمەرگە هەردەم ئامادەیە گیانی خۆی فیدا بکات و بۆ سەربەستی گەلەکەی و پەرستاریش بەبەردوام بۆ خزمەت کردن هەموو هەوڵ و کۆششی خۆی دەدات لە پێناو تەندروستییەکی باش و هەردووکیان پیرۆزن.

**• ژیانی خێزانیت چۆن پێک هێناوە؟**

- لە ساڵی (١٩٧٢) خێزانم پێک هێناوە کە خزمی خۆمەو ئێستا (٥) کچ و (٤) کوڕم هەیە توانیومانە ژیانێکی خۆش و ئاسوودە بگوزەرێنین.

**• سەرکەوتنی پەرستاری لە چیدا دەبینی؟**

- دەبێ پەرستار بەبێ لایەنی ئیش بکات جیاوازی لەنێوان چین و توێژەکان نەکات لە خزمەتدا بەیەک چاو سەیری هەموو لایەک بکات.



**• بۆ بە محەمەد نەجمەدین دەڵێن (قشتۆ)؟**

- ئەوە نازناوی پێشمەرگایەتیمە لەساڵانی (١٩٦٢-١٩٦٣) تفەنگێکم هەبوو قۆنداخەکەی زۆر درێژ بوو و خۆشم گچکە بووم پێیان دەوتم پێشمەرگەیەکی قشتی و لە (١٩٦٤) مەفرەزەیەکمان کرد بارزانی بە رەحمەت بێت پرسیارێکی لێمان کرد دوایی فەرمووی (خودێ مرۆیەکی قنجە) ئەنگۆ چت بێژنێ؟ وتمان (قشتۆ) هەتا ئێستا ئەوە نازناومە.

**• چ پێشنیارێکت هەیە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی پەرستاری لە کوردستان؟**

- خولی جۆراوجۆر بۆ پەرستاران بکرێتەوە کۆڕو سیمینار بەردەوام هەبێت لەمەڕ بەرزکردنەوەی ئاستی پەرستاران.

**• کێن ئەو کەسانەی کە خۆت بەقەرزاریان دەزانی؟**

- من خۆم بە قەرزاری هەموو کەس دەزانم گەر ساتێ ئەم توانیبێ خزمەتی هەموو کەس و خاکی خۆم بکەم.

**• مام قشتۆ حەزی لە خواردنێکێ کوردییە؟**

- تەنها ساوەر.

**• قەد لەکاری پەرستاری بێزار بوویت؟**

- هەستم بە بێزاری نەکردووە هەر بۆیەش ئێستا بەو هەستەوە کاردەکەم و خانەنیشنم کەچی بە (عقد) گرێ بەست گەڕامەتەوە بۆ ئەوەی خزمەتی خەڵک بکەم.

**• دوا وتەت؟**

- زۆر سوپاس بۆ ئێوە کە پەرستاران بەسەردەکەنەوە هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.

# هەواڵی جیهانیی پەرستاریی

**سەندیکای پەرستاری ئوردن بڕیاری دا کە مووچەی ئەندامەکانی لە ناوەوەی ئوردن لە ٥٠٠ دیناری ئوردنی کەمتر نەبێت هەروەها لە دەرەوەی ئوردن لە ١٥٠٠ دیناری ئوردنی کەمتر نەبێت. لە کاتێکدا کە ٧٠ دیناری ئوردنی نزیکەی ١٠٠ دۆلارە.**

**سەندیکای پەرستاری سعودی لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٦ ـەوە بڕیاری دا کە ئەو کۆمەڵانەی خوارەوە بۆ تایبەتمەندییەکانی پەرستاری دابمەزرێت:**

کۆمەڵەی پەرستارانی قەستەرەی دڵ ولوولەکانی خوێن.
کۆمەڵەی پەرستارانی گورچیلە.
کۆمەڵەی پەرستارانی بایەخدانی چڕ.
کۆمەڵەی پەرستارانی تەندروستی دەروون.
کۆمەڵەی پەرستارانی هەناسەدان.
کۆمەڵەی پەرستارانی نەخۆشیە گشتیەکانی هەناو.
کۆمەڵەی پەرستارانی تەندروستی کۆمەڵ.
کۆمەڵەی پەرستارانی نەخۆشیە گشتیەکانی برینکاری.
کۆمەڵەی سەرپەرشتیارانی پەرستاریی.
کۆمەڵەی پەرستارانی تەندروستی پیشەیی.
کۆمەڵەی پەرستارانی تەندروستی قوتابخانەکان.
کۆمەڵەی پەرستارانی نەشتەرگەری.
کۆمەڵەی پەرستاران بایەخدانی تەندروستی سەرەتایی.
کۆمەڵەی پەرستارانی ئێسک و جومگە.
کۆمەڵەی پەرستارانی فریاکەوتن و تەنگاویی.
کۆمەڵەی پەرستارانی کۆئەندامی هەرس.
کۆمەڵەی سەرپەرشتیارانی فێرکردنی پەرستاریی بەردەوام.
کۆمەڵەی پەرستاران و مامانەکانی ئافرەتان و منداڵبوون ـــ تەنها بۆ پەرستارو مامانەکان.
کۆمەڵەی پەرستاران و مامانەکانی منداڵان و تازەبووان ـــ تەنها بۆ پەرستارو مامانەکان.

پەرستارانی زانکۆی پەرستاریی ئاغا خان لە پاکستان لە فیستیڤاڵی پێکردنی مۆمی ٢٥ ساڵەدا سوێندی خۆیان دەخۆن. ئەم فێستیڤاڵە لە ڕۆژی ٢٠٠٦/٦/١٢ لە کەراچی ساز دراوە.



لەم وێنەیەدا پرۆفیسۆرێک لە تەمەنی ٥٧ ساڵیدا دەبێتە پەرستارو هەڵسەنگاندنی باری تەندروستی نەخۆشێک ئەنجام دەدات.
پرۆفیسۆر (ڕۆجەر کیتۆک) پرۆفیسۆری زانیاریەکانی ئاژەڵ کە خانەنشین کراوە بۆ پێویستی ماڵەکەیان دوای ئەوەی ساڵەهای ساڵ بوو وەکو توێژەرێک لە بواری هۆڕمۆنەکانی گیانەوەراندا کاری دەکرد، لەم ڕۆژانەدا بڕوانامەی دبلۆم لە پەرستاری وەردەگرێت. هاوسەری (ڕۆجەر کیتۆک) پەرستارەو لە تەمەنی چوار ساڵیدا میوانێکیان هاتووەو بە میوانەکەی گوتووە کە ئارەزووی ئەوەی هەیە ببێتە پەرستار، لە ئەنجامی ئەو هەڵوێستە میوانەکە کاتژمێرێکی بە دیاری پی بەخشیوە. بەڵام پیاوەکەی دوای ٥٧ ساڵ و دوای دوو هەفتە لە گفتوگۆی ئێواران بڕیاری داوە کە ببێتە پەرستار. ناوبراو وتی من ناڵێم کە بەرەو ژیانێکی ئاسانتر چووم، بەڵکو بەرەو ژیانێک چووم کە مانایەکی زیاتری هەیە.



# نەخۆشخانەی زەیتون

# یەک ئامانج و ئەرکێکی زۆر

ریپۆرتاژ: گۆڤاری پەرستار



بە مەبەستی ئاشنابوونی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان لە سیستەمی بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەی زەیتون و سیستەمی بەڕێوەبردنی پەرستاری لە نەخۆشخانەکەدا، شاندێکی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان کە بریتی لە بوو لە بەڕێزان (هوشیار ئەمین ئەحمەد) سەرۆکی کۆمەڵەکەمان و دوو ئەندامی دەستەی باڵای کۆمەڵە بەڕێزان (رزگار عبدالرزاق) و (دیلمان صلاح) سەردانێکی ئەو نەخۆشخانەیان کرد. دوای پێشوازیەکی گەرم لە لایەن دەستەی کاروباری پەرستاری نەخۆشخانەکە، شاندی کۆمەڵەکەمان کۆبوونەوەیەکی کرد لەگەڵ مێجەر (جۆن جۆنگ جیۆ ) سەرۆکی دەستەی کاروباری پەرستاریی لە نەخۆشخانەکەدا هەروەها خاتو لیندا. لە سەرەتادا پێناسەو ئامانجەکانی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان لە لایەن سەرۆکی کۆمەڵەکەمان ئاشکرا کرا ئینجا ئامانجەکانی سەردانەکە روون کرانەوە کە بریتی بوون لە ئاشنا بوون بە چالاکیەکانی نەخۆشخانەی زەیتون و سوودوەرگرتن لە ئەزموونەکانی کاروباری پەرستاری لە نەخۆشخانەکەدا. ئینجا مێجەر جۆن ووتی کە خۆشحاڵە بەوەی یەکەم جارە دەربارەی کۆمەڵەی پەرستارانی کوردستان ئاگادار بکرێتەوە. دوای ئەوە ئامانجی کردنەوەی ئەم نەخۆشخانەیەی روون کردەوە کە لە سەرەتادا بریتی بووە لە چارەسەرکردنی سەربازە کۆریەکان و هێزەکانی عیراقی بەڵام سەرباری ئەوەش خزمەتگوزاریەکان بۆ خەڵکی هەرێمی کوردستانیش دابین دەکات. دەربارەی هاریکاری لەگەڵ پەرستاراندا بەڕێزیان گوتی کە ئەوان لایەنێکی سەربازین بەڵام خۆی هەوڵی ئەوە دەدات کە دوای گەڕانەوەی بۆ کۆریای باشور ئاگاداری کۆمەڵەو سەندیکا مەدەنیەکانی پەرستارانی کۆریا دەکاتەوە بە مەبەستی زیاتر ئاشنا بوون لە چالاکیەکانی یەکتری. ئینجا باسی ئەوەی کرد کە لە کۆریای باشوردا شانبەشانی کۆمەڵەی پەرستارانی کۆریا کە کۆمەڵەیەکی مەدەنییە، کۆمەڵەی سەربازیی پەرستارانی کۆریاش هەیە کە خۆی یەکێکە لە ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵەیە. هەروەها لە کۆریادا کۆمەڵەی پەرستاران لقی تری لی جیا بۆتەوە هەروەک کۆمەڵەی پەرستارانی سڕکردن و کۆمەڵەی پەرستارانی چاودێری چڕ.
دەربارەی نەخۆشخانەکە مێجەر جۆن لەسەرەتادا باسی بەشەکانی کرد کە بریتین لە:یەکەی فریاکەوتن، تیشک، نۆڕین، تاقیگە، دەرمانخانە، چاودێریی چڕ، سۆنەر، نەشتەرگەریی، ددانسازیی، گوێ و لووت و قوڕگ، هەناو، ئافرەتان، پیاوان. هەروەها ووتی نەخۆشخانەکە بچووکەو رووبەرێکی بچووکی داگیرکردوە کەچی خۆزگەی ئەوەیان هەیە کە رووبەری نەخۆشخانەکە گەورەتر بکرێت. لە راستیدا ئێمە تێبینی ئەوەمان کرد کە هەرچەندە نەخۆشخانەکە بچووکە کەچی خزمەتگوزاریەکی رێکوپێک دابین دەکات. نەخۆشخانەکە دوو قاووش و دوو ژووری نەشتەرگەری تیادایە کە قاووشێکیان حەوت جێگەی پیاوانەو ئەوی تر شەش جێگەی ئافرەتانە. سیستەمی بەڕێوەبردنی پەرستاری بریتیە لە هەبوونی سەردەستەی پەرستاران Nurse Chief و سەرۆکی پەرستاران Nurse Head هەروەها پەرستاری بەرپرس Nurse Charge.

دوای کورتە باسێک دەربارەی نەخۆشخانەکە شاندی کۆمەڵەکەمان لەگەڵ مێجەر جۆن و خاتو لیندا سەردانی گشت بەشەکانی نەخۆشخانەکەی کرد.

سیستەمی هاتنە ژووردوەی نەخۆش بە جۆرێکە کە هەموو ئەو خزمەتگوزاریانەی پێشکەشی دەکرێت بە تۆڕی ناوەکی Intra-net کۆمپیوتەرەوە جێبەجی دەکرێت و هیچ کاغەزێک بە دەست نەخۆشەوە نابینیت بە جۆرێک کە لەسەرەتادا ناوەکەی لە کۆمپیوتەر دەنووسرێت و بە تۆڕی کۆمپیوتەر بۆ پزیشک دەچێت ئینجا ناوی دەرمانەکەشی بە هۆی تۆڕی کۆمپیوتەرەوە بۆ دەرمانخانە دەنێردرێت. هەروەها پشکنینی خوێن و پشکنینەکانی تر بە هۆی ئامێری ئەلکترۆنی دەکرێن و داواکردنی پشکنینە تاقیگەییەکان بە هۆی تۆڕی ناوەکی کۆمپیوتەرەوە لە لایەن پزیشکەوە دەنێردرێن بۆ تاقیگەو بە هەمان رێگاش ئەنجامەکان دەنێردرێنەوە بۆ پزیشکی چارەسەرکار.

دەربارەی چالاکیەکانی نەخۆشخانەی زەیتوونە لە رووی مەشقکردنی پزیشک و پەرستارانی دەزگا تەندروستیەکانی

sicians and nurses in the hospital, Major Jeon said that the five groups of physicians and nurses who work in Erbil health facililities had been trained iin the hospital. Each group included 5 physicians and 5 nurses who had been trained for 8 weeks in different parts of the hospital. Yesterday the hospital staff had arranged a one day traing for the staff of Emergency Hospital of Erbil on the Bone Pathophysiology, sterilization of equipment and care of fracture wounds.






شاری هەولێر، مێجەر جۆن ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە تاوەکو ئێستا پێنج گرووپ لە نەخۆشخانەکەدا مەشقیان کردوە کە هەر گروپێک پێکهاتوە لە پینج پزیشکی پیاوو و پێنج پەرستاری ئافرەت. هەر گروپێک بۆ ماوەی هەشت هەفتە لە بەشە جیا جیاکاندا مەشقیان کردوە. هەروەها دوێنێ یەک رۆژە مەشقیان بۆ ستافی نەخۆشخانەی ئیمێرجێنسی رێکخستوە دەربارەی نەخۆشیەکانی ئێسک و تەکنیکی پاکژکردنەوەی ئامێرەکانی نەشتەرگەریەکانی ئێسک و بایەخ پێدان و تیمارکردنی برینەکانی ئێسک.

دەربارەی هاوکاری کردنی تیمی نەخۆشخانە لەگەل نەخۆشەکاندا، خاتو (ئاشتی مەسعود) ووتی من ماوەی دوو هەفتەیە لەم نەخۆشخانەیەم بەهۆی سووتانی (روو) مەوە بە جۆرێک زۆر بە چاکیی چارەسەرکراوم و لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا لە ژێر چاودێریی دایەو بایەخدانێکی چاکم پی دراوە لەگەل جۆرێکی باش لە خواردن. خاتو ئاشتی دلخۆش بوو کە لە رێگای گۆڤارەکەمانەوە سوپاسی تیمی نەخۆشخانەی زەیتون و سەرجەم گەلی کۆریای باشوور بکات کە سەلماندیان ئەوان دۆستی ئێمەن. هەروەها بەڕێز (عومەر عەزیز) کە بەر لە چەند رۆژێک هاتۆتە ئەم نەخۆشخانەیە بە مەبەستی نەشتەرگەری لووت کە سەرکەوتوانە بووەو جۆرێکی باشی لە بایەخدان پێشکەش کراوە لەگەل دابینکردنی پێداویستی پزیشکیەکان بە شێوەیەکی باش. بەڕێزیان هیوای ئەوەی خواست کە نەخۆشخانەکانی تریش هەمان جۆرە بایەخدان پێشکەش بە خەلکی کوردستان بکەن.

Regarding the collaboration of the hospital staff with the patients, the female patient (Ashty Masood) said that I had been admitted to this hospital since two weeks due to my burned face. She said that her burn had been treated very well under 24 hours supervision with good care and nutrition. She was pleased to thank the hospital staff through the (Nurse) magazine and she appreciated the Korean people who prooved that they are our friend. Mr. (Omar Aziz) the male patient said that he had been admitted to Zaytun Hosputal before few days for a nasal operation which was successful with the good quality of care and the well provided medical equipment. He hoped that the other hospitals in the region will provide the same quality of care for the people.

لە پرسیارێکدا دەربارەی ئاستەکانی خوێندنی پەرستاری لە کۆریای باشووردا، بەڕێز مێجەر جۆن ووتی کە خوێندنی پەرستاری لەم وولاتەدا لە دوو جۆرە کۆلیجی پەرستاری دەکرێت کە یەکێکیان بۆ ماوەی چوار سالەو ئەوی تریان بۆ ماوەی سی سالە بە جۆرێک کە دووەمینیان باوترە. هەروەها خوێندنی بالاش لە بواری پەرستاریدا هەیەو بۆ نمونە مێجەر جۆن خۆی پەرستارێکە کە خاوەن بڕوانامەی ماستەرە لە ئاماری تەندروستی Statistics Health.

Answering a question about levels of nursing education in South Korea, Major Jeon replied that there are two types of Bachleor degree in Korea. One of them is 4 years study and the other one is 3 years study, the latter one is more common. Three is higher nursing education as well, while Major Jeon hereself has obtained master degree in Health Statistics.



# Zaytun Hospital

## One main objective with many functions

For the purpose of increasing familiarity about the hospital management system and the nursing management system in the Zaytun Hospital, a group from the Kurdistan Nursing Association (KNA) had visited this hospital. This group included Mr. Hoshyar Amin Ahmed. the head of the association with Mr. Rizgar Abdulrazzaq and Deelman who are two editorialist members of the Kurdistan Nurses Journal (Paristar)* . After a warm welcome from the nursing group of the hosputal. The representatives of KNA have held a meeting with Major Jeon Jong Jeo , the nursing leader of the hospital and Ms. Linda. At the beginning of the meeting, Mr. Hoshyar Amin Ahmed, the head of KNA has presented a brief information about the the definition and the objectives of KNA. He briefed the objectives of this visit that included our association's desire to be familiar about the hospital's activities and getting benefits from the hospital's experiments regarding the nursing affairs. Major Jeon has pretended that she is pleased to know about the KNA for the first time. She has presented the establishment of the hospital that was treatment of Korean and Iraqi forces at the beginning but at the same time the hopital provides sevices for the people of Kurdistan as well.

* The word (Paristar) means (Nurse) in Kurdish Language.

Regarding partnership with the KNA, she said; for the reason that they are military health care providers, after her being back to South Korea, she will inform the civilian Korean Nursing Association and the syndicate about the KNA and the partnership with KNA. Her excellency declared that beside the civilian Korean Nursing Association there is a Military Nursing Association in South Korea. Meanwhile, she is one of the members of the Military Nursing Association and there are other branches for the Korean Nursing Association such as Anesthetist Nurses Association and Intencive Care Nursing Association. Talking about the Zaytun Hospital, she started her word about the 13 departments of



the hospital that occupies a small piece of ground aiming that the hospital will be extended to a larger portion at the future. The hospital contains the following departments: Emergency, Radiology, Endoscopy, Laboratory, Pharmacy, Intensive Care, Sonic Aid, Operation Unit, Dentestry, ENT, Medical Unit, Men's and Women's Ward.

We noted that although the hospital is small but the provision of the srvices is well organized. The hospital contains two wards with two operation rooms as well. One of the wards consists of 7 beds for male patients and the other with 6 beds for female patients. The Nursing Skeleton is based on having a Chief Nurse, Head Nurse and Charge Nurse.

After the brief information about the hospital, our group jointly with Major Jeon and Ms. Linda have held an orientation visit to the hospital departments. Starting from the first step of admission, the patients are registered in a computarised system that is linked with the Intranet of the hospital. The patient's name will be sent to the physician through the Intranet program and the prescription will be sent to the pharmacy by the same system without finding any paper in the patients' hands containing the prescription or doctor's orders. The laboratory investigation orders are sent to the laboratory through the Intranet and the results will be back to the physician through the same way. Speaking about the activities of the hospital in regard to training of phy-

# بۆچی پەرستار؟

سەرنووسەر



زۆر جار ئەگەر شتێک دووبارە بکرێتەوە و بەردەوام بزرینگێتەوە بە گوێی مرۆڤدا جۆرە بێزاریەک دروست دەکات بە تایبەتی ئەگەر لە بواری راگەیاندندا بێت ئەوا زۆرتر ئەو بێزاریە ئەشونۆما دەکات چونکە راگەیاندن لە ناواخنی خۆیدا دەبێت شتێک پێشکەش بکات بە خوێنەر یاخرد بینەر یا بیسەری خۆی کە لەگەڵ زەوق و سەلیقە و زەمینەسازی زەهنی مرۆڤدا بگونجێ ئەمە بە نسبەت راگەیاندن بە گشتی بەلام شتێک هەیە لە نێو خودی راگەیاندن کە زیاتر دەتوانین بیخەینە قالبی پرۆپاگەندە کە بەشێکی دانەبراوە لە راگەیاندن ئەویش راگەیاندنی رێکخراوەیی یە کە زیاتر راگەیاندکار یاخود رۆژنامە نووسی رێکخراوەیی پێی هەلدەستی بۆیە زۆر جار لە نێو خودی راگەیاندنی رێکخراوەیی چەند شتێک بۆ چەندەها جار دووبارە دەبێتەوە کە ئەمەش حالەتێکی سروشتییە لە کاری رۆژنامەوانی و راگەیاندنی رێکخراوەیی چونکە لەسەرەتاوە گوتمان راگەیاندنی رێکخراوەیی زیاتر دەچێتە قالبی پرۆپاگەندە کردن بۆ رێکخراوەکە ئەویش بە ئاراستە باشەکەیەوە، چونکە راگەیاندنی رێکخراوەیی هەموو هەولێکی بۆ داکۆکی کردن و دەرخستنی رووە باشەکانی ئەو رێکخراو و کۆمەڵە و سەندیکایەیە کە خاوەنی پیشەیەکی تایبەت یاخود توێژێکی تایبەتی ناو کۆمەلگان بەتایبەتی ئەو رێکخراو و سەندیکایانەی کە پێویستی ژیان و ژیاری خەلکن وەکو سەندیکاکانی (پزیشکان و پەرستاران) و هاوشێوەکانی کە خاوەنی توێژێکن هەمیشە ژیانی مرۆڤ پەیوەستە پێیانەوە لەم روانگەشەوە راگەیاندنی رێکخراوەیی دەبێت رۆلی خۆی ببینێت لە داکۆکی کردن لە مافی ئەندامەکانی نێو رێکخراو و کۆمەلە و سەندیکاکان لە هەمان کاتیشدا دەبێت رۆلی ئەکەتیڤ ببینێت لە هۆشیار کردنەوەی خەلک بە پێی کاری رێکخراوەیی خۆی و سروشتی ئەو پیشەیەی کە هەیەتی، لەم روانگەشەوە کۆمەلەی پەرستارانی کوردستان وەکو کۆمەلەیەکی زانستی و رێکخراوەیی تایبەت بە پەرستاران هەمان ئەو خەسلەتە رێکخراوەییەی هەیە وەکو رێکخراو و سەندیکاکانی تر کە بۆ پێشخستن و بەرەو پێشبردنی هۆشیاری تەندروستی لە لایەک و داکۆکی کردن و پێشخستنی پیشەی پەرستاری لە لایەکی ترەوە دامەزراوە، بۆیە راگەیاندنی کۆمەلەی پەرستارانی کوردستان هەمان خەسلەتی راگەیاندنی رێکخراوەیی هەیە کە رێکخراوێک یان کۆمەلەیەک بۆ پێشخستنی پیشەکەیی و پێش چاو خستنی کارەباشەکانی بۆ خەلک دەیکات چونکە پەرستاران بە یەکێک لە توێژە گرنگەکانی پێکهاتەی کۆمەلگا و پێکهاتەی خزمەتگوزاری حکومی دادەنرێن، زانست و پیشەی پەرستاریش بە یەکێک لە زانست و پیشە سەرەکییەکانی زانستی پزیشکی دەژمێردرێت بۆ ئەم مەبەستەش کۆڤاری پەرستار بە یەکێک لە گۆڤارە نۆبەرەکانی زانستی پەرستاری کە تایبەت بێت بە پەرستاران و پیشەی پەرستاری ئەژمار دەکرێت ئەمەش دوای ئەوەی کە کۆمەلەی پەرستاران کۆنفرانسی خۆی بەست و بە شێوەیەکی یاسایی کەوتە سەر رێچکەی کارەکانی، ئەکری بلێن گۆڤاری پەرستار هەولێکە بۆ راستکردنەوەی ئەو تێروانینە چەوتەی کۆمەلگایە بەرامبەر بە پیشەی پەرستاری هەروەها رێگە خۆشکەریشە بۆ هەموو ئەو پەرستارانەی کە دەیانەوی خەرمانێک بخەنە سەر پێشخستنی زانستی پەرستاری و هەولێکە بۆ ئاشنابوون بە سیستەمی پەرستاری وڵاتان و دەرخستنی چۆنییەتی پیادەکردنی وەکو خۆی لە هەمان کاتیشدا گۆڤاری پەرستار هەرلێکە بۆ ئاراستەکردنی رای گشتی پەرستاران بەرەو ئەو ئامانج و ستراتیژیەتی کارو پیشەسەی پەرستاران لە نێو بۆتەی کاری رێکخراوەیدا بۆ ئەوەی پەرستارانیش لە گۆڕانکاریەکانی نێو کۆمەلگای کوردی دانەبرێن لە هەموو بوارەکاندا، بە پێی ئەم بووچونەش داوا لە پەرستاران دەکەین هاوکاریمان بکەن بە بەشداری کردن لە گۆڤارەکەتان بە نووسینی بابەت لە هەموو رووەکانی (زانستی پزیشکی، پەرستاری، دەروونی. ..هتد) بۆ ئەوەی بتوانین لە داهاتوودا خزمەت بە پەرستاران و پیشەی پەرستاری بکەین.